الدَّبْرُ: ماڵو سامانی زۆر، پورە هەنگو کۆمەڵە زەردەواڵە ٥ لە هەموو شتێك دواوەی ٥ دەگوترێ: (جعلت كلامه دَبْرَ أذني) قسەکەی فلانکەسم پاشگوێ خست.

الدُّبُرُ: پشت: سمتو کەفەڵ ٥ لە هەموو شتێك کۆتاییو دواییی.

الـدَّبَرَانُ: لە زاراوەی ئاسمانشوناسی دا پێنج ئەستێرەن لە بورجی ئەور، ئەور بۆ خـۆی گەورەکەیانـە، کەلوێـکی مانگـە ٥ هەندێـکیش دەڵـێن: ئەسـتێرەیەکە کەوتۆتـە نێوان ثورەییاو جەوزاوە.

الدَّبْرَة: پارچە زەوییەکە چاك کرابێ بۆ کشتوکاڵ.

جۆگـای ئـاو لـەنێو زەوییـە گـشتوکاڵیەکاندا ٥ تێـشکان لەشەڕدا ٥ دەگوترێ: (جعل الله عليهم الـدبرةَ) خـودا شـکانو سەرشـۆڕی بەسـەردا هێنـان، (جعـل الله لهـم الـدَّبْرَة) خـودا سـەرکەوتنی بـۆ مەیـسەر کـردن بـە تێـشکانی دوژمنەکەیان.

الـدَّبرةُ: داهـاتوو، دواوە پێـچەوانەی رابردوو پیش وەخت.

الدَّبَرَة: برینی ولاخ ٥ تێشکان لەشەڕدا.

الـدَّبرِيُّ: ئـەو کەسـەی دوادەکـەوێ لەهاتنـدا دواکەسـی هـاتوو ٥ پـاش تێپەڕبوونی کات دەگا ٥ نوێژکردن لەدوا کاتی دا.

الـدَّبور: رەشـەبایەکە لـەخۆر ئـاواوە هەڵدەبێ پێچەوانەی بای شەماڵ.

الْمُدَابَرُ: وەجاخزادەو رەسەن.

الْمُـدَابِرُ: ئـەو کەسـەی لـە قورمـاردا لـە قوداحەکە دەدا.

الْمُسْتَدْبِرُ: کەسێـك بەرەو بەختەوەریی بچێ.

أدبـسـت الأرضُ: زەوی گیـاو گـژی دەرکـردو رەشو سـەوزی تێـکەڵاو بوو.

دَبَّسَهُ: داپۆشیو شاردییەوە.

دَبَّسَ الْخُفَّ: گۆرەوییەکەی پینەکرد.

دبّـسَ الورقـة ونحوهـا: کاغـەزەکانی بەدەمبوس لێکدا.

اِدْبَسَّ: رەنگـی سور بـوو کـەمی رەنگـی رەشی تێکەڵ بوو.

الدِّبْسُ: ئەوەیە رەنگـی سوربێو رەشـی تێـکەڵ بـێ ٥ (هـي دَبْـسَاءُ)٥ (ك: دُبْس).

الـدِّبْسُ: دۆشـاوی تـرێ دوای ئـەوەی دەکوڵێندرێ.

الـدِّبِسُ: دۆشـاوی خورمـا یـان شیلەی خورما.

الدُّبْـسَةُ: شـتی رەنـگ سـوری رەش

تێگەڕاو ○ جۆرە کۆترێکە.

**الـــدَبّاسُ**: دۆشـــــاو دروســـــتکەر، دۆشاوچی ○ دۆشاو فرۆش.

**الدِّبسُ**: خەڵکی زۆرو هەمە جۆر.

**الدَّبوسُ**: گۆچانی دار یان ئاسن.

**الـــدَّبوس**: دەمبـــوس ○ کەرەســـتەیەکی بچوکە لـە ئاسـن یـان مـەعـدەنی تـر وەکـــوو بزمـــارو دەرزی، سەرێـــکی خڕو ئەوی تری تیژ شتی پێ لێـك دەبەستری.

**دَبَـــشَهُ دَبْـــشاً**: توێـــکڵەکەی لێ کـــردەوە سپیکرد ○ خواردی ○ دەگوترێ: (دَبَشَ الجرادُ الأرضَ وفیها) کوللە گیاوگژی ناو زەوی خواردو روتاندییەوە.

**ألـــدَّبّاشُ**: لافـــاوی گـــەورەو ســـامناك‌و رادەر، راماڵەر.

**الدِّبْشُ**: کەرەستەو شت‌و مـەکی ناومالْ کە بێ کەڵك بوبن.

**دَبَـــغَ الجلـــدَ**: پێـــستەکەی لەدەباغـــدا، خاراندی، تاڵی گزگڵك‌و شـتی وای لێ دا ○ پارچـــە گۆشـــت‌و رزیـــوی لێ کردەوە.

**دَبْغَهُ**: بەمانا (دَبَغَهُ) دێ.

**إنْدَبَغَ**: بۆ موطاوعەی (دَبَغَهُ) دێ.

**الـــدِباغ**: ئـەو کەرەســتـەو مادانــەن کـە پێستی پـێ دەبـاغ دەکـرێ بۆ ئـەوە پێـــــستەکە بخـــارێ‌و کەڵــــکی لێ وەربگیرێ ○ (ك: دُبُغ).

**الدِّباغة**: بەمانا (الدَّبّاغ ) دێ ○ پیشەی دەباغچیەتی.

**ألدَّبّاغُ**: کاری دەباغچییەتی‌و خاراندنی پێـــست بـــۆ ئـــەوەی کەڵـــکی لێ وەربگیرێ.

**الدِّبْغُ**: ئەو مادانەی پێستی پێ دەباغ دەکرێ ○

**الدِّبْغَةُ**: بەمانا (الدِّبْغُ) دێ ○ (ك: أدباغ).

**الدُّبوغ**: ئەو بارانەیە زەوی لـە پـیس‌و پۆخەڵی پاك دەکاتەوە.

**الْمَدْبَغَــةُ**: شـوێنی دەبـاغکردن، دەبـاغ خانـە ○ ئـەو پێستەی دەخرێتـە نـاو دەباغەوە ○ (ك: مَدابِغَ).

**دَبَقَ الطائِرَ**: بەدەبکە باڵندەکەی گرت.

**دَبِقَ دبقاً**: پێوەی نووسا ○ (دَبِـقَ بالـشيء) بەشتەکەوە نووساو لێی نەبووەوە.

**دَبَّقَ الطائِرَ**: بەمانا (دَبَقَهُ) دێ.

**تَدَبَّقَ**: بۆ موطاوعەی (دَبَّقَهُ) دێ.

**تَدَبَّقَ الشَّيْءَ**: شتەکە پێوەی نووسا.

**الدّابُوقُ**: هەر شتێـك لینـج بـێ‌و لەزگـە ئاسابێ؛ باڵندەو مێشی پێ بگیرێ.

**الدُّبوقُ**: یاری منداڵان.

**الدُّبوقَــةُ**: مـوی بـادراوی چـندراو، یـان موی شی کراوە.

**الـــدِّبْقُ**: بـــەمانا (الـــدابُوقُ) دێ (ك: أدباق).

**الدُّبقيَّةُ**: قوماشێکه له شاروچکەی (دبیق)ی میصری دروست دەکرێ.

**الْمُدَبَّقُ**: دەگوترێ: (عیش مُدَبَّقٌ) ژیانێکی تەواو نیه زۆری کەم‌و کوڕی تێدا هەن.

**دَبَلَ الشَّيءَ دبلاً ودبولاً**: شتەکەی هەنگوك هەنگوککرد دەگوترێ: (دَبَلَ العجينَ) هەویرەکەی هەنگوك هەنگوککرد ٥ پارچە پارچەی کرد خڕی هەڵدان هەروا دەگوترێ.

**دبل الأرضَ**: زەوییەکەی بەزبڵ تێکردن بەهێزکرد.

**دَبَلَ فلاناً بالعصا**: لێکدان لێکدان بە گۆچان له فلان کەسی دا.

**دَبَلَ دَبَلاً**: قەڵەو بوو خۆی دارشت‌و گۆشتن بوو.

**دَبَّلَ الشَّيءَ**: شتەکەی خڕهەڵداو کردی بەگۆ.

**الدُّبالُ**: زبڵ‌و زاڵ ٥ مەوادی عوضوی یان نەباتی کەمێك رزی بێ یان بەتەواوی پۆڵکابێ‌و هێزبدا بە خاکەکە بۆ کشتوکاڵ.

**الدَّبْلُ**: جۆگا ٥ تاعون‌و پەتا.

**الدِّبْلُ**: گریان ٥ بەڵاو کارەسات ٥ (ك: دُبولٌ).

**الدُّبْلَةُ**: هەنگوتکە هەویری زل ٥ تەشتە هەویر ٥ پاروی گەورە ٥ دوومەڵێکە لەناو سکدا پەیدا دەبێ‌و کوشندەیە ٥ کونی پاچ‌و تەشوی ٥ ئەڵقەی زێڕو زیو بەشێوەی سادە دەکرێتە پەنجە.

**الدَّبُولُ**: ئافرەتی کۆست کەوتوو کە شین‌و شەپۆڕ بکا ٥ بەڵاو کارەسات ٥ دەگوترێ: (دبلته الدَّبول).

**الدُّبَيْلَةُ**: بەڵاو کارەسات ٥ دەگوترێ: (دبلته الدُّبيلة).

**الدَّوْبَلُ**: کودەڵە بەراز (ك: دوابل).

**الدِّبلوم**: بڕوانامەیەکە لە بڕوانامەی زانکۆ لەژوور بەکالوریوس‌و خوار دکتوراوەیە ٥ وەکوو ماجستێر وایە.

**الدُّبْنُ**: کەوو پەرچی ئاژەڵ لە قەفەزاز (چندرابێ) تەنرابێ ٥ (ك: أدبان ودبون).

**الدُّبْنَةُ**: پاروی گەورە.

**دَبَى دَبْياً ودبٌ**: بەمانا (دبٌ) دێ.

**دُبِيَتِ الأرضُ**: کوللە بێستان‌و گیاو گژی ناو زەوییەکەی خوارد.

**أَدْبَتِ الأرضُ**: زەوییەکە کوللەی زۆر بوو.

**الدُّبَى**: کوللە پێش ئەوەی بتوانێ بفڕێ ٥ هەنگ.

**الْمَدْباةُ**: زەوییەك کوللە بێتانی زۆر بێ.

**دَثَّتِ السماءُ دَثّاً**: ئاسمان بارانێکی کەمی باراند.

دَثَّتِ السماءُ الأرضَ: ئاسمان بارانێکی کەمی باراندە سەر زەوی.

دَثَّ الشَّيءَ: شتەکەی پاڵ پێوەنا.

دثَّ فلاناً: پاشباش لەفلانکەسی دا.

دثَّ فلاناً بالحجر: بەردی لەفلان گرت بەردی پێ دادا.

دثَّ فلاناً بالعصا: بە گۆچان لەفلانی دا.

دُثَّ فلان دَثّاً وَدَثَّةً: ئەندامێکی جەستەی فلان بەسروشت خواربوو.

الدَّثُّ: تەنیشت ٥ بارانی کەم ٥ (ك: دِثاث).

الدَّثاثُ: کەسێکە بە قۆچەقانی راوی باڵندە بکا (ك: دُثاثٌ).

الدُّثَّةُ: هەلامەتی سوك، پەسیوییەکی کەم ٥ (ك: دُثَثٌ).

دَثَرَ الشَّيءَ دُثوراً: کۆن بوو رۆژگاری زۆری بەسەردا تێپەڕی.

دَثَرَ المَنزِلُ: خانووەکە کۆن بوو روخا.

دَثَرَ الثوبُ: قوماشەکە چڵکن بوو.

دَثَرَ السیفُ ونحوه: شمشێرەکە ژەنگی هێنا چونکە لەمێژە مشتو ماڵ نەکراوە.

دَثَرَ القلبُ: دڵەکە غافڵ بوو ژەنگی گرت.

دَثَرَ فلان: فلان پیر بوو کەوتەساڵەوە.

دَثَرَ الشَّجرُ: درەختەکە گەڵای کردو لق‌و پۆپی زۆر بوون.

دَثَّرَ الطائِرُ: باڵندەکە هێلانەکەی خۆی رێك‌و پێك کرد.

دَثَّرَ علی المیت: گۆڕی مردووەکەی هەڵچنی.

دَثَّرَ فلاناً: جوببەو عەبای لەبەر فلانکەس کرد.

تَداثَرَ: بەمانا (دَثَرَ) دێ.

تَدَثَّرَ: عەبای پۆشی ٥ خۆی بەعەباو جوببە داپۆشی.

تَدَثَّرَ الشَّيءَ: سەرشتەکە کەوتو بەسەری دا زاڵ بوو.

إدَّثَرَ: بەمانا (تَدَثَّرَ) دێ.

انْدَثَرَ: بەمانا (دَثَرَ) دێ.

الأدْثَرُ: بێ ئاگا.

الداثِرُ: بێ ئاگا ٥ کەسێك زۆر گرنگی بەخۆ رێکخستن نەداو پۆشاك چڵکن‌و سەرو ریش ژاکاوبێ.

الدِّثارُ: پۆشاکێکە لەسەر پۆشاکی پێویست لەبەر دەکرێ.

الدَّثارِيُّ: پیاوی تەمبەڵ‌و کارنەکەر.

الدَّثْرُ: زۆرو زەبەندەی هەموو شتێك ٥ دەوڵەمەندو ساماندار ٥ لە حەدیثدا هاتووە: (ذهب أهل الدثور بالأجور).

الدِّثْرُ: کەسێك بزانێ جوان سەرو کاری ماڵی خۆی بکا.

الدَّثَرُ: چڵك ٥ (ك: أدثار).

المُدَّثِّر: بەمانا (المتدثِّر) دێ ٥ هەروا بەمانا (الدِّثاری) دێ.

دَجَّ دجّاً ودجیجاً: کەوتە رۆیشتن ٥ پەلەی

کرد، بازرگانی کرد، بۆیە دەگوترێ: (ما حَجَّ ولکن دجّ) فلانکەس بەمەبەستی حەجو عیبادەت نەچووە بۆ مەککە بەڵکوو بە مەبەستی بازرگانی چووە.

**دَجَّ السَّطْحُ**: بانەکە دڵۆپەی کرد.

**دَجَّ اللیلُ**: شەوەکە زۆر تاریك بوو.

**دَجَّ السِتر دجاً**: پەردەکەی دادایەوە.

**دجَّجَتِ السماءُ**: ئاسمان هەوراوی بوو.

**دجَّجَ فلان**: فلانکەس خۆی بەستو چەکی هەڵگرت.

**دَجَّجَ فلاناً**: چەکی لەفلان بەستو پڕچەکی کرد.

**تَدَجَّجَ**: بۆ موطاوەعەی (دَجَّجَهُ) هاتووە ٥ دەشگوترێ: (تَدَجَّجَ في سلاحه) بەچەکەوە خۆی ڕانواند.

**الدَّاجُّ**: ئەو چاو ساغو حەماڵو خزمەتکارانەن کە لەگەڵ حاجیاندان، دەگوترێ: (أقبل الحاجُّ والداجُّ) حاجیو خزمەتکارو چاوساغو چاپەزو حەماڵو قەتارچی هەموویان گەڕانەوە.

**الداجَّةُ**: بەمانا (الداجُّ) دێ.

**الدُّجَاجَةُ**: مریشك بە نێرو مێیەوە ٥ واتە: مریشكو کەڵەشێر ٥ ئەو بەرزاییەی لە بەرسنگی ئەسپ پەیدا دەبێ ٥ سەرەتەشی (ك: دَجاج ودُجَجٌ).

**الدُّجاجيّ**: تاریك ٥ دەگوترێ: (أسود دجاجيٌّ)، (لیل دجاجيّ وشعر دجاجيٌّ).

**الدُّجَّة**: ئەوپەڕی تاریکی ٥ (ك: دُجَجٌ).

**الدُّجُوجُ**: بەمانا (الدُّجَاجی) دێ، دەگوترێ: (لیل دجوجيّ وشعر دجوجيّ).

**الدَّجِيجُ**: بەمانا (الدُّجاجيّ) دێ.

**الدَّيْجُوجُ**: شەوی زۆر تاریك واتە: هەر بەمانا (الدّجاجي) دێ.

**المُدَجَّجُ**: کەسێك پڕ چەك بێ ٥ چەکی تەواوی لەخۆ بەستبێ ٥ ژیشك.

**دِجْ دِجْ**: دەنگێکە مریشكو کەڵەشێری پێ بانگ دەکرێ.

**دجْدَجت الدجاجة**: مریشکەکە بازی دا هەڵفڕی.

**دَجْدَجَ فلان**: فلانکەس بانگی مریشکەکانی کردو وتی (دج دج).

**دَجْدَجَ اللیلُ**: شەوەکە تاریك بوو.

**الدَّجْداجُ**: ڕەشو تاریك لە هەرشتێك بێ ٥ زۆر تاریك.

**دَجِرَ دَجَراً**: سەرسام بوو، سەرخۆش بوو.

**دَجِرَ الناسُ**: خەڵکەکە توشی ئاژاوەو گێرەوەژ بوو ٥ (هو دجَرٌ ودجران وهي دجرى) ٥ (ك: دُجرى).

**داجَرَ**: هەڵهات.

اندجر الحبل والوتر ونحوها: حەبلەکە یان ژێیەکە شل بۆوە.

الدُّجر: لۆبیاء ٥ لە حەدیثی عومەردا هاتووە: (اشترلنا بالنوی دجراً) ٥ لوتی هەوجار؛ ئەودارەی گاسنەکەی پێوە قایم دەکرێ.

الدِّجران: ئەو دارەی رادەنگێودرێ بۆ کەپرو سابات.

الدیجور: تاریك و رەش ٥ دەگوترێ:(لیل دیجور ودیمة دیجور وتراب دیجور).

الدَّیجوريُّ: تاریکایی و ڕەشایی.

دَجَلَ: درۆو چاوو راوی کرد.

دَجَلَ الشَّيءَ: شتەکەی داپۆشی ٥ (دَجَلَ السيفَ) شمشێرەکەی زەرکەفت کرد.

دَجَلَ الحقَ: حەق و راستی تێکەڵ بە درۆو ستەم کرد.

دَجَلَ الأرضَ: زەوییەکەی بەزبڵ تێکردن بەهێزو پیت دارکرد.

الدُّجَالُ: زبڵ و شیاکە.

الدجالة: قەتران.

الدَّجَّالُ: ناوی زێڕ ٥ دروزن و ساختەچی و چاوو راوکەر ٥ جەجاڵ.

الدَّجَّالـة: هاوەڵی زۆرو بارگرانو بەئەرك و ئورك.

الدُّجَیْلُ: بەمانا (الدُّجالة) دێ.

دَجَمَ اللیلُ دجماً ودُجْمَةً: شەوەکە تاریك بوو.

دَجِمَ: غەمناك بوو.

دُجِمَ: بەمانا (دَجِمَ) دێ.

الدَّجْمُ: جۆر، دەگوترێ: (أمن هذا الدَّجْم أنت): ئەوە تۆ لەم جۆرەکەسانەی؟

الدِّجْمُ: هاوڕێی نزیك ٥ رەوشت ٥ (ك: دجوم)

الدُّجْمَـةُ: ڕێبازو پەیڕەوو پرۆگرام ٥ هاوڕێی نزیك.

دَجَنَ الیومُ: ئەمڕۆ هەمووی هەورو تەم و غاربوو.

دَجَنَ السماءُ: ئاسمان بارانی باران.

دَجَنَ بالمكان: لەو شوێنە نیشتەجێ بوو، وەگری بوو پێوەی راهات دەگوترێ: (دَجَنَ الحیوان، ودَجَنَ الطیر).

أدجَنَ: چووە ناو هەورو تەمو مژەوە.

أدجَنَ الیومُ والسحابُ: بەمانا (دَجَنَ) دێ.

أدجن السماءُ: ئاسمان بارانەکەی درێژەی کێشا.

أدجن علیه الحُمیَ: لەرزو تای توشبووە لەکۆڵی نابێتەوە.

داجَنَه: بەباشی تێکەڵاوی کرد.

الدَّاجِنُ: هەر ئاژەڵ و باڵندەو دەعبایەك ماڵی ببێ و رام ببێ لەگەڵ ئادەمیزاددا هەڵبکا ٥ (ك: دَواجن).

**الدَّجْنُ**: ئەو حاڵەتەیە هەور سەرانسەر وڵات دابگرێ.

**الدُّجْنَةُ**: رەشایی، تاریکی، (ك: دُجَنُ).

**المِدْجَانَ**: ئەو حەیوانەیە ماڵی بێ لەهەر جۆرێك بێ ٥ (ك: مداجين)٥.

**دَجَا دجْواً ودَجُوّاً**: تەواو بوو پێکەیی.

**دجا السَحَابُ**: هەورەکە بڵاو بووە.

**دجـا الليـل**: شەوەکە بەتاریکی خۆی دونیای داگرتو هەموو شتێکی داپۆشی.

**دَجَـا الـشَّيْءَ دَجْـواً**: شتەکەی داپۆشیو پەردەی پێدادا.

**أدْجى**: بەمانا (دَجَا) دێ.

**أدْجى الشَّيْءَ**: بەمانا (دَجَاهُ) دێ.

**داجَـاهُ**: رقو کینی خۆی لێ شاردەوە دوژمنایەتی بۆ دەرنەخست.

**تَدَجىًّ**: بەمانا (دَجَا) دێ.

**الدَّاجِيَـــــــــةُ**: تـــــاریکی ٥ (ك: دَوَاجِ) ٥ دەگوترێ: (نعمـة داجيـة) نیعمەتێکی زۆرو زەبەندە.

**الـــدُّجى**: رەشـایی شـەو تاریـکو تونەکی ٥ دەگوترێ: (ليلة دَجىً).

**الدُّجَةُ**: قوپچەی کراس ٥ (ك: دُجى).

**الدُّجِيَّـةُ**: تاریکایی ٥ کۆختەی راوچی (سەنگەری راوچی)

**الدَّياجى**: تاریکیەکان.

**دَحَبَهُ دحْباً**: پاڵی پێوەنا.

**دَحَجَهُ**: سویەوە، خورانـدی، قاڵی کـردو هێنایو بردی رایکێشا.

**دَحَّ في قفاه دحاً ودحوحاً**: پاڵی پێوەنا.

**دَحَّ فلاناً**: دەستی بڵاو کـردەوەو پیاماڵی، دەسـتی بـڵاو کـردەوەو کێـشای بەجەسـتەی فلانکەسـدا ٥ پـاڵی بەفلانکەسەوەنا.

**دَحَّ الـشَّيءَ**: شـتەکەی پـانو پـۆڕ کـرد هاوساندی ٥ دەگوترێ: (دَحَّ الطعـامُ بَطْنَـهُ) خواردنەکـە ورگـی لێـك کشاندەوە.

**دَحَّ الشَّيءَ في الأرض**: شتەکەی بەزەویدا پـان کـردەوە تـا چـاك چـاك بەزەوییەکەدا نووسا.

**إنْدَحَّ**: بۆ مطاوعەی (دَحَّهُ) دێ.

**الـــدُّحُوحُ**: بــــەرفراوانو پــــانو بـەرین ٥ ئافرەتی گـەورە ٥ حوشـتری زەلامو کەتە ٥ (ك: دَحَحٌ).

**دِحْ دِحْ**: وشـەیەکە کـە ئاراسـتەی ئـەو کەسـە دەکـرێ کـە دان دەنـێ بەکردارەکـەی، مەبەسـت لێـی بێـدەنگ بەوچی دی درێـژە بـەدان پیانانەکەت مەدە.

**الدُّحَادِحُ من الرجال**: پیاوی کورتە باڵای ورگ زل (ك: دَحادِح).

**الدَّحْداحُ**: بەمانا (الدَّحَادِحُ) دێ.

**الدِّحْدِحُ**: ئافرەتی کورتە باڵای ورگ زل.

الدحيْحَةُ: بەمانا (الدَّحادِحُ) دێ.
دَحَرَهُ: خولاندییەوە.
دَحَرَهُ دَحْراً ودُحوراً: پاڵی پێوەناو دوری خستەوە.
انْدَحَرَ: بۆ موطاوەعەی (دَحَرَهُ) دێ.
دَحْرَجَهُ دَحْرَجَةً دِحْراجاً: خستیە جەو جوڵو بەرەو خوار پاڵی پێوەنا ◦ بەدەوری خۆی دا خولاندییەوە.
تَدَحْرَجَ: بۆ موطاوەعەی (دَحْرَجَهُ) دێ.
الدُّحْروجَةُ: خولخولۆکە ئەوەی دەیخولێنیتەوە ◦ ئەوەی قالونچە لەزبڵو زاڵو پیسایی کۆی دەکاتەوەو خڕی هەڵدەدا ◦ (ك: دَحَاريج).
الدُّحْرُجُ: دانەوێڵەیەکی خڕی بچکۆلەو رشکەڵەیە تێکەڵ بەگەنم دەبێ وەکوو گژنیژە.
الْمُدَحْرَجُ: خڕو خولاوە.
الْمُدَحْرِجُ: قالۆنچە.
دَحَسَ السُّنْبُلُ دَحْساً: گوڵە گەنمو جۆکە خۆی پڕ کردو کامڵ بوو، دەشگوترێ: (دَحَسَ الزَّرْعُ).
دَحَسَ الْبَيْتُ: خانووەکە بەخاوەن ماڵو منداڵی خاوەنەکەی ئاوەدان بووە.
دَحَسَ بيده في الذبيحة: پەنجەکانی خستە نێوان پێستو گۆشتی کوشتییەکە بۆ ئەوەی بیگروێ.
دَحَسَ بِرِجْلِهِ: بەقاچی شتەکەی سەرو ناوکرد بۆ ئەوەی بزانێ چییەو چی نییە.
دَحَسَ بالشَّر: پێی رێکخستو پانی کردەوە بەجۆرێك نەزانـدرێ چۆن بووە.
دَحَسَ بين القوم: فیتنەو ئاشوبی لەناو خەڵکەکە نایەوە.
دَحَسَ بين الصفوف: کەلو کونی ناو رێزەکانی پڕکردەوە.
دَحَسَ الإِنَاءَ: زەرفەکەی پڕکرد.
دَحَسَ ما في الإناء: ئەوەی لەقاپەکەدا بوو هەڵیلوشی لستیەوە.
دَحَسَ الشَّيْءَ في الشَّيْءِ: شتەکەی خستە ناو شتەکەی ترەوە.
دَحَسَ الحديثَ عنه: قسەکەی لێ شاردەوە.
دُحِسَتِ الأَصَابِعُ: پەنجەکان توشی زیپکەو بالوکە بوون، نێوان نینۆكو گۆشتی پەنجەکانی جۆرە نەخۆشییەکیان لێ پەیدابوو.
أَدْحَسَ السُّنْبُلَ: گەنمو جۆ دووروەکەی گێرەکرد.
الدَّاحِسُ: جۆرە زیپکەو برینداربیەکە لەنێوان نینۆكو گۆشتی پەنجەکان پەیدا دەبێ دەبێتە هۆی دەرهاتنی نینۆکەکان ◦ جۆرهاوساوىو گرێ

پەیدا بوونێکە لە پەنجەکاندا پەیدا دەبێ.

**الدَّاحُوسُ**: بەمانا (الداحِسُ) دێ.

**الـدِّحاسُ**: پڕبوون و پاڵەپەستۆو قەرەباڵغی ە دەگوترێ: (بیت دِحاسٌ) ماڵێکی خێزاندارو قەرەباڵغە.

**الـدُّحَاسُ**: پیرۆیەکە، خشۆکێکە، کرمێکە زەردە لەژێر زەویدا دەژی دێنن و دەیکەنە کەپک و داو بۆ چولەکە گرتن ە (ك: دَحَاحِیس).

**الدَّحاسَةُ**: بەمانا (الدَّحاسُ) دێ.

**الدَّحْسُ**: کشتوکاڵ: کە گوڵەکانی پڕبن و کامڵ بێ.

**الدَّیْحَسُ**: شتی زۆرو زەبەندە.

**دَحَصَ دَحْصاً**: پەلەی کرد.

**دَحَصَ الأرضَ برجله**: بەقاچی گڵەکەی پشکنی و ئەمدیوو ئەودیوی کرد ە دەشگوترێ: (دَحَصَ المذبوحَ برجله)ە بەقاچ کوشتییەکەی ئەمدیوو ئەودیووکرد.

**دَحَضَتْ رِجلُه دَحْضاً ودحوضاً**: قاچی هەڵخلیسکا.

**دَحَضَت الشَّمسُ**: خۆر بەلای ئاوابوون کلابوو.

**دَحَضَت الحجةُ**: بەڵگەکە پوچایەوە.

**دَحَضَ برجله دحضاً**: بەقاچی شتەکەی پشکنی.

**دَحَضَ عن الأمر**: لەکارەکەی کۆڵییەوە.

**دَحَضَ رجله**: قاچی هەڵخلیسکاند.

**دَحَضَ الماءُ الأرضَ**: ئاوەکە وای لە زەوییەکە کرد قاچی لێ هەڵبخلیسکێ.

**دَحَضَ الحُجَّةَ**: بەڵگەکەی پوچ کردەوەو رەتی کردەوە.

**ادْحَضَهُ**: پاڵی پێوەناو لەشوێنی خۆی لەقی کرد ە هەڵیخلیسکاند دەگوترێ: (ادْحَضَ القَدَمَ).

**ادْحَضَ الحجّةَ**: بەڵگەکەی پوچ کردەوە.

**الداحِضُ**: دەگوترێ: (فلان داحِض) فلانکەس رارایەو هەردەم لەسەر بارێك و لەهەوایەك لێ دەدا.

**الدَّاحِضَةُ**: دەگوترێ: (حُجّة داحضة) بەڵگەیەکی پوچەڵ کراوەیە ە بەڵگەیەکی بێ بنەماو پوچە.

**الـدَّحْضُ**: خلیسکان ە خلیسکاوی، دەگوترێ: (مکان دَحْضٌ).

**الـدَّحَضُ**: دەگوترێ: (مکان دَحَضٌ) شوێنێکی خلیسکە.

**الدَّحُوضُ**: بەمانا (الدَّحَض) دێ.

**المِدْحَاضُ**: شوێنی هەڵخلیسکان.

**المَدْحَضَةُ**: شوێنی هەڵخلیسکان ە (ك: مداحِض).

**دَحَقَتْ يدُهُ عن الشَّيْءِ دَحْقاً ودحوقاً ودحاقاً**: دەستی نەگەیشتە شتەکە،

دەستی کورتی هێنا.
**دَحَقَتِ الحامِلُ بِالجنین**: ئافرەتە سك پڕەکـــــەی منداڵەکـــــەی لەبارچوو ○ (دَحقت الحامِلُ بِرَحِمِها) ئافرەتەکـــە منداڵـــدانی خـــۆی دەرهێنا.
**دَحَقَ الشَّيْءَ**: شتەکەی پاڵ پێوەنا ○ دوری خـستەوە، دەری کـرد، دەگـوترێ: (دَحَقَ النـاسُ فلانـاً) خەڵـکەکە چ گرنگێکیان بەفلان کەس نەدا.
**أَدْحَقَـهُ**: دوری خـستەوەو دەری کـرد، دەگوترێ:
**أَدْحَقَـهُ الله**: خـودا لـە هـەموو خێـرو بێرێ بێ بەشی کرد.
**اِنْدَحَقَ**: لەشوێنی خۆی راساو رۆیی.
**اِنْدَحَقَ بطنُه**: ورگی زل بوو.
**الـداحِقُ**: ئافرەتێـکە دوای منـداڵبون منداڵدانی بێتەدەر ○ (ك: دواحِق).
**الدُّحاق**: هاتنە دەرەوەی منداڵدان دوای منداڵبون.
**الـدُّحُوقُ**: کەسێـکە زۆر چـاوی جـەو جـــوڵ بکــــاو نـــــەتوانێ رایبگرێ ○ ئافرەتێك دوای منداڵبون رەحەمی بێتەدەر ○ هەروا ئافرەتێك بەسکێك زیاد لە منداڵێکی ببێ.
**الـدَّحِیقُ**: دەرکـراو ○ دەگـوترێ: (فـلان دحیـق القـوم) فلانکـەس دەرکـراوو رەتێنـــد راوی گەلـــە ○ هــــەروەها بەئافرەتێـك دەگـوترێ: بەسکێـك زیاد لە منداڵێکی ببێ ○ چاو کە زۆر جـــەو جـــوڵ بکـــاو خاوەنەکـــەی نەتوانێ بیوەستێنێ.
**دَحْقَبَهُ**: لـەدواوە بەتونـدی پـاڵی پێوەنـا پاڵەپەستۆی دا.
**الدُّحْقُومُ**: کەتەو زەبەلاح ○ ورگ زل.
**دَحَـــلَ دحْـــلاً ودحلانــاً**: چـووە نـاو پەناپەسـیو ○ دابو نـەریتی عـەرەب وەهابوو لەناو ماڵەکەیانـدا ژورێـکی پـچکۆلە پەناپەسێوێـك شوێنێـکی بەلاوە یان دروست دەکرد بۆ ئەوەی کە میوانیان هات ئافرەتیـان خۆیـان بخزێننە ئـەو پـەنا پەسـیوەو میوان نـەیان بینـێ ○ بـەو شـێوێنە پەنایـە دەگوترێ: (الدَّحْلُ).
**دَحَلَ دحلاً**: چووە پەنا رەشماڵەکە، چووە دوا خێوەتەکـــە ○ ترســـاو خـــۆی شاردەوە ○ هەڵهات.
**دَحَــلَ الأرضَ دَحْــلاً**: لـە زەوییەکـەدا چاڵێـــکی هەڵـــکەند ســـەرەوەی تەسكو بنکی پان.
**دَحَـلَ البئـرَ**: ئـەملاو ئـەولای بیرەکـەی هەڵکۆڵی.
**دَحِلَ دَحلاً**: کورتـە بـاڵا بـوو قەڵەو بـوو، ورگـــی گـــەورە بـــوو شـــۆڕ

بوّوه ٥ رەوشتی ناشیرین بوو فێڵباز بوو ٥ لەماڵەکەدا خۆی گرت تا بەویستی خۆی شتەکەی کرێ ٥ زۆرو زەبەندە بوو.

أدْحَلَ: چوونە ناو پەنا پەسێوەوە، چووە ژوری کەنارەوە.

داحَلَهُ مُداحلةً ودحالاً: جاوو راوی لێکرد ٥ زانیارییەکەی لێ شاردەوەو بەکەسانی تری گوت.

الدَّاحِلُ: دڵ پیس‌و کیناوی.

الدَّاحُولُ: تەڵەو کەپکە بۆ گرتنی ناسك‌و رێوی‌و دەعبای لەو جۆرە ٥ (ك: دواحیل).

الدَّحَالُ: نێچیرەوان کە نێچیر بەتەڵە بگرێ.

الدَّحْلُ: چاڵێکە لەزەوی هەڵدەکەندرێ لای سەرەوەی تەسك‌و لای خواروی پان‌و پۆر: پەنا پاسارێکە عەرەب لەناو خانوودا دروستی دەکەن بۆ ئەوەی کە میوانیان هات خێرا ئافرەتیان بچنە ئەوێ‌و میوانەکە نەیانبینێ ٥ شوێنێك ئاوی تێدا کۆبێتەوە ٥ (ك: أدحُلّ وأدحال ودِحال).

الدَّحْلاءُ: بیر سەرەکەی تەسك‌و ژێرەوەی پان‌و پۆربێ.

الدُّحْلَةُ: بەمانا (الدَّحْلاء) دێ.

الدُّحُولُ: بەمانا (الدحلاء) دێ ٥ نەبانی حوشتر لەیەکتر.

الدُّحِيلَةُ: چاڵێکە لەناو زەویدا سەرەوەی تەسك‌و ژێرەوەی پان.

دَحْلَقَ بَطْنُهُ: گەدەی هەوای کرد (سکی فش بوو).

دَحَمَهُ دحْماً: بەتوند پاڵی پێوەنا.

الدَّاحُومُ: تەڵەو کەپك بۆ گرتنی رێوی‌و ناسك‌و کەروێشك.

الدِّحْمُ: بنەماو بنیچە، دەگوترێ: (هو من دِحم فلان) ئەوە لەنەوەی فلانە.

دَحْمَرَ القِرْبَةَ: دیزەکەی پڕکرد.

دَحْمَسَ اللَّيْلُ: شەو تاریك بوو، تاریکییەکەی پەرەی سەند.

الدُّحَامِسُ: رەش‌و زۆر تاریك ٥ ئازاو کەتەو زەبەللاح.

الدَّحْمَسُ: تاریك: زۆر تاریك: هێزەی سرکە.

الدُّحْمَسُ: بەمانا (الدَّحْمَسَ) دێ.

الدِّحْمِسُ: بەمانا (الدَّحَسُ) دێ ٥

الدُّحْمُسَانُ: رەشی زۆر کەتەو زەبەللاح ٥ لە حەدیثدا هاتووە: (کان یُبایع الناسَ وفیهم رجل دُحْمُسان) هەروا بەمانا ئادەمیزادی ئەحمەقی کەتەو زەبەللاح دێ ٥ دەگوترێ: (رَجُلٌ دحساني).

الدُّحْمُسَةُ: تاریك، زۆر تاریك ٥ (ك: دحامس).

**الدُّخْمُسَة**: تاريك، زۆر تاريك، دەگوترێ: (ليلة دخمسة).

**دَخْمَلَهُ** ربه: خولاندیەوە ، بەراكشاوی‌و فرێدراوی لەسەر زەوی بەجێی هێشت كوژرا بوو پێی لێ دەنرا.

**الدُّحامِلُ**: ئادەمیزادی كەتەو گۆشتن.

**الدَّحْمَلُ**: ئەو كەسەی پێستی شۆڕ بوبێتەوە.

**الدَّحْمَلَةُ**: ئافرەتی كەتەی زەلام.

**دَحِنَ دَحَناً**: قەڵەو بوو بووە كوڵەبنە، ورگی زل بوو داچۆڕا ، رەوشت ناشیرین بوو.

**الدَّحَنُ**: زەلامی ورگ شڕی گەدە زلی كورتە باڵا.

**الدَّحِنَةُ**: بەمانا (الدَّحَنُ) دێ ، ئەستورو خەپلەو پان، تەپۆڵكە.

**الدَّحُونَةُ**: بەمانا (الدّحَن) دێ .

**الدَّيْحَانُ**: كوللە.

**دحا البَطْنُ دَحْواً**: ورگی لەبەر گەورەیی داچۆڕاوە.

**دَحَا الفرسُ**: ئەسپەكە دەستەكانی بەسەر زەویدا ڕادەكێشێ ، سمەكانی لەزەوی بەرز نەكردەوە.

**دَحَا الشَّيءَ**: شتەكەی راخست‌و بڵاوی كردەوە ، دەگوترێ:

**دَحَا اللهُ الأرضَ**: خودا زەوی راخست پانی كردەوە ، پاڵی پێوەنا.

**وَحَا الماشِيةَ**: ئاژەڵەكانی رادان لێی خوڕین.

**تَدَحَّى**: بڵاو بۆوەو بەرفراوان بوو.

**تَدحَّت الإبلُ في الأرض**: حوشترەكە پێكۆڵی كرد ، زەوییەكەی ژێر خۆی چاڵكرد ، كاتێك حوشتر ئەم پێكۆڵە دەكا كە قەڵەو دەبێ.

**الأُدْحُوَّةُ**: شوێنی هێلكەكردنی نوعامەو بێچو هەڵهێنانی.

**الأُدْحِيَةُ**: بەمانا (الأُدحوة) دێ ، بۆیە بەنوعامە دەگوترێ: (بنت أُدْحيه).

**الدَّحِيَةُ**: مەیمون.

**الدِّحْيَة**: سەرۆكی عەسكەر.

**المِدْحَاةُ**: دارێكە منداڵ یاری پێ دەكا ، یارییەكە دانیشتوانی مەككە لەناویاندا باوە، ئەم یارییە بریتییە لەچەند بەردوچكەیەك وەكو حەب، چەند كونێكی بچكۆلە هەڵدەكەنن ئەنجار كەمێك لێیان دوردەكەونەوە بەردەكان ئاڕاستەی كونەكان دەكەن، جا ئەگەر بەردەكە یەكە یەكە چوونە كونەكانەوە ئەوە براوەیە، ئەگینا دۆڕاوە.

**الدُّحُونةُ**: بڕوانە (دَحَنَ).

**دَخَّهُ دَخّاً**: زەلیل‌و ژێردەستەی كرد.

**دَخَّ دَخْخاً ودُخَّةً**: رەنگی رەش‌و لێڵ بوو ، دەگوترێ: (هو أَدَخ وهي دَخَاءُ).

**الدَّخُ**: دوكەڵ (الـدُّخُ) دوكەڵ ە روەكێـكە لەناو باخدا.

**دُخْ دُخْ**: وشــــەيەكە دەگـــــوترێ: بەمەبەسـتی بـۆڕدانی كەسێـك و بێدەنگكردنی.

**دَخْـدَخَ**: پەلـەی كـرد، خێـرا خێـرا هــەنگاوی هــەڵێنا ە هــەنگاوەكانی كورت كردنەوە ە ماندوبوو.

**دَخْدَخَ عن كذا**: وازی لێ هێنا (دَخْـدَخَ عنه كذا): فلان شتی لێ مەنعكرد.

**دَخْـدَخَ القـومَ**: سـەری لەخەڵـكەكە شـێواندو زەلیلـی كـردن و وڵاتـی داگیركردن.

**تَدَخْـدَخَ**: بـۆ موطـاوەعـەی (دَخْـدَخَهُ) دێ ە وێكهاتەوە كرژ بوو.

**تَدَخْدَخَ اللّيل**: تاریكی شەو تێكەڵاو بـە بونەوەربوو.

**الدُّخادِخ**: كورتە باڵا.

**الدَّخْدَخُ**: پێرۆیەكی زەردە قاچی زۆرن (هەزارپێ).

**الدُّخدُخ**: بـەمانا (الدُّخادِخ) دێ ە هـەروا بەمانا (الدَّخداخ) دێ.

**دَخْدَرَهُ**: زەركەفتی كرد.

**الدَّخْـدَارُ**: ئـاڵتون ە جـۆرە قوماشێـكی بەنرخ بووە.

**دَخِرَ دَخُوراً**: بچوك بـوو زەلیـل و ملكـەچ كەوت.

**دَخِرَ دَخَراً**: بـەمانا (دَخَرَ) دێ ە سـەری لێ شێوا، سەر سام بوو.

**أدْخَـرَهُ**: ژێـر بـاری كـرد، زەلیلـی كـرد، ملكەچی كرد.

**إدَّخَرَهُ**: بڕوانە وشەی (إدَّخَرَ).

**الادّخار**: پەزمەنـدەكردنی بـڕێ داهاتـە بۆ دوا رۆژ.

**دَخْرَصَ الأمرَ**: كارەكەی ئاشكرا كرد.

**الدُّخْرِصُ**: تیرۆژو ئـەو پارچـە قوماشـە درێژكۆڵەیـە كـە دەخرێتــەوە سـەر كـراس و شـتی وا بـۆ ئـەوەی پـان بـێ ە ئـەو كەسـەی خۆدەخاتـە نـاو كـارو بـارەوەو لێیـان دەزانـێ ە (ك: دخاریص).

**الدَّخْـــرِصةُ**: ئــەو پارچــە قوماشــە درێژكۆلەیـە كـە دەخرێتـەوە سـەر كـراس و شـتی وا بـۆ ئـەوەی پـان بێ ە تاقم و كۆمەڵ.

**دَخِسَ دخوساً**: قەڵەو بوو، خۆی داڕشت، گۆشت و بەزی سەریەك نا.

**دَخَـسَ فِي كـذا**: دزەی كـردە نـاو فـلان كۆمەڵ، چووە ناو فلان شتەوە.

**دَخَسَ الشّيءَ دَخساً**: شتەكەی شاردەوە.

**دَخِسَ لَحْمُهُ دَخساً**: گۆشتی جەستەی زۆر بوو كۆبۆوە، پڕبوو.

**دَخِسَ عَظمُهُ**: ئێسقانی پڕ بوو لە مۆخ.

**دَخِسَ الحافِرُ**: دەوروبەری سمـی وڵاخەكە

هاوسا ٥ دەگوترێ: (فرس دَخِسٌ) ئەسپێکی عەیبدارە.

أدخسَ: بەمانا (دَخَسَ) دێ.

أدخسَ الشّيْءَ في كذا: شتەکەی لەوێدا شاردەوە.

الدِّخاسُ: زۆر زەبەندە ٥ پڕو لێوان لێو ٥ دەگوترێ: (عدد دخاس) ژمارەیەکی زۆر ٥ (بيت دخاس) ماڵێکی پڕ ٥

درع دِخاسٌ: زرێیەکی حەڵقەپچوکە.

الدّخسُ: قەڵەوو تێکسمڕاو . جوانە ورج (ورچی گەنج) . جۆرە ماسییەکە.

الدَّخسُ: هاوساوییەکە لە دەوروبەری سمی ولاخ.

الدُّخسُ: جینسی گیاندارانی دەریا لە پێری ماسی لەوێنەی دۆلفین.

الدَّخُوسُ: ئافرەتی کەتەو قەڵەو

الدّخيسُ: زۆرو چڕو لێك هاڵاو . گیاو گژی تێکچڕژاو . گۆشتی توندو پتەو، زەندی قاچی ولاخ . گۆشتی بەری دەست.

الدَّيْخَسُ: کەسێك خێرو پیاوەتی تێدا نەبێ . گیاو گژی زۆرو تێکچڕژاو

الْمُدَاخِسُ: گیانلەبەری گوشتنی ئێسقان پڕ لە مۆخ، دەگوترێ: (جَمَلٌ مداخِسٌ).

دَخَلَ المكانَ ونحوه وفيه دُخُولاً: چووە ناو شوێنەکە.

دَخَلَ بالعروس: چووە پەردەی زاوایەوە.

دَخَلَ في الأمر: دەستی بەکارەکەی کرد.

دَخِلَ دَخَلاً ودَخْلاً: ناوەوەی داوەشا وێران بوو، ناوەوەی عەیبدار بوو، دەگوترێ: (دَخِلَ أمْرُهُ) کارەکەی گەندبوو.

دُخِلَ: بەمانا (دَخِلَ) دێ ٥ کزو لاواز بوو.

دُخِلَ الحبُ: دانەوێڵەکە سوێ زۆر بوو.

دُخِلَ على فلان: فلانکەس خەیاڵی بۆ شتێك چوو وانە بوو بەخۆی نەزانی کەوتە هەڵەوە.

أدخَلَهُ المكانَ ونحوه: خستیە ناو ئەو شوێنەوە.

داخلت الأشياء: شتەکان چونە ناو یەکەوە، تێك گیران،

داخَلَ فلاناً في أموره: هاوکاری فلانکەسی کرد لەکارەکانی دا.

دَخّلَهُ: بەمانا (أدخَلَهُ) دێ.

دَخَّلَ التمرَ: خورماکانی خستنە ناو زەمبیلەکەوە.

إدَّخَلَ: بەمانا (دَخَلَ) دێ ٥ زۆری هەوڵدا بۆ چوونە ناو.

تداخلت الأشياءُ: بەمانا (داخلت) دێ ٥

تداخلت الأمور:کارەکان تێکەڵاو بوونو لێك جیاناکرێنەوە.

تَدَخَّلَ: بۆ موطاوەعەی (دخَلَه) دێ ٥ کەم کەم چووە ناو ٥ بەناچاری چووە ناو کارەکەوە.

تَدَخَّلَ في الخصومة: لەخۆیەوە چووە ناو کێشەکەوە بۆ ئەوەی بەرگری لە بەرژەوەندییەکی خۆی بکا، بێ ئەوەی لایەنێک بێ لەلایەنەکانی کێشەکە.

الداخل: لە هەموو شتێک دا دیوی ناوەوەیەتی.

الداخلة من الأزار: دیوی ناوەوەی دەربێ کە لەجەستە دەکەوێ.

الداخِلة من الأرض: زەوی بێ سەرو بەرو نەپشکندراو.

الداخلة من الإنسان: نییەتو نیازی ئادەمیزاد.

الداخليّ: شتێک پاڵ داخل بدرێ، ناوخۆیی.

الدِّخالُ في الورد: ئەومیە حوشترەکەی بخاتە نێوان دوو حوشترە ناو هەڵێنجەرەکانەوەو ئاوی بدا، دەگوترێ: (سقی إبلَهُ دِخالاً) ٥ پالی ئەسپ.

الدُّخَّالُ: دەگوترێ: (فلان دخالٌ في الأمور) فلانکەس زۆر خۆ لەکارو بار هەڵدەقورتێنێو دەچێتە ناو روداوەوە.

الدُّخَّلُ: جەستە گەورەو تێکسمڕاو ٠ جۆرە باڵندەیەکە بەتۆپەڵاکی درەختی بەرزەوە دەنیشێ.

الدُّخّلُ من الكلأ: ئەو گیاو گژەیە کە لەناو بنکی درەختەکان روابێو بەناویان دا بڵاو بوبێتەوە.

الدُّخَّلُ من اللحم: ئەو گۆشتەیە بەئێسقانەوە نوسابێ

الدُّخّلُ من الإنسان: ناوەرۆکو دەرونی ئادەمیزاد ٥ (ك: دخاخيل).

الدُّخْلَةُ: هەموو گۆشتێکی کۆبووەوەی توندو پتەو.

الدَّخَلُ: داهاتو وارپاتی تاکەکەسو خێزان ٥ دەردی ناوقوڵایی جەستە ٥ فەسادو گەندەڵی ٥ شکو گومان ٥ دڵو دەرونی ئادەمیزاد.

الدَّخْلُ القومي: لەزاراوەی زانستی ئابوری دا کۆمەڵێک نرخو بەهایە بۆ هەموو جۆرە کاڵاو خزمەتگوزارییە پێشکەشکراوەکان لەماوەی ساڵێکدا هی دەوڵەتێک لە دەوڵەتەکان.

الدَّخَلُ: فەسادو گەندەڵی ٠ عەیبو لەککە ٥ دەرد ٥ شکو گومان ٥ درەختی چرو تێکچڕژاو ٥ خێزانو بنەماڵەیەک بچنە ناو بنەماڵەیەکی ترەوەو خۆیان بە بەشێک لەوان بزانن لە راستیشدا لەوان نەبن.

الدَّغْلَــةُ: شــوێنی هــەنگوین کردنــی هــەنگ، (شانە هــەنگوین) نــاوەوەی جەستە.

الدَّخــلَةُ: شــەوی بــووكو زاوایــی ٥ ناوەوەی جەستە.

الدِّخْلَةُ: ناوەڕۆکی شتو ڕوداو ٥ دیوی ناوەوەی ئادەمیزاد، دەگوترێ: (هــو عفیــف الدِّخلــة) ئــەو دڵو دەرون پاکــە ٥ (هــو خبیــث الدِّخلــة) ٥ دڵو دەرون پیــــسە ٥ تێــــکەڵاوکردنی دورەنگــە بــۆ ئــەوەی ڕەنگێــکی تــر دەربچێ.

الــدَّخیلُ: کەسێــك بــچێتە نــاو قــەومو خێڵێکەوەو خۆ بداتــە پاڵ ئــەوانو خۆبەیــەکێ لــەوان حیــساب بکــاو لــەوانیش نــەبێ ٥ میــوان ٥ هــەر وشــەیەك چــوبێتە نــاو زمــانی عەرەبییــــەوەو لــــەو زمانــــە نەبێ ٥ ئەسپێك بکەوێتە نێوان دوو ئەســپی پێــشبڕکێوە ٥ بێــگانە کــە دەچێتە وڵاتێکەوە بۆ ئەوەی سودی لێ وەرگرێ ٥ (ك: دُخَلاءَ).

الدَّوْخَلَةُ: زەمبیلەیەکی پوشینەخورمای تێ دەکرێ.

الدَّوْخَلَّةُ: بەمانا (الدَّوْخَلَةُ) دێ.

الْمَــدْخَلُ: چــونە نــاو شــتەوە ٥ شوێنی چــونە نــاو باڵەخانــەوە ٥ دەگــوترێ: (هــــو حــــسن المَــــدْخَلِ) پلانــی بــەڕێوەبردنی کارەکــانی ڕێــکو پێــکە ٥ باش کارەکانی ئەنجام دەدا ٥

الْمُــدْخَلُ: جــۆرە ئەشــکەوتو پــەنا پاسارێکە شتی تێ دەکرێ.

الدُّخْــلُلُ: کەسێــك خــۆ لــەکارو بــاری خەڵــــك هــــەڵقورتێنێ ٥ نــــاخو نــاوەڕۆکی ئــادەمیزاد ٥ باڵندەیــەکی بۆرەقنەیە.

الدِّخْلَلُ: بەمانا (الدُّخْــلُلُ) دێ ٥

الدِّخْــلِلُ: ئــەو بــەزەی دەچــێتە نــاو گۆشتەوە.

دَخْــمَسَ علیــه: ئــەوەی دەیویــست پێــی بڵێ پێی نەگوتو لێی شاردەوە.

دَخْمَسَ الشَّیْئَ: شتەکەی لێ شاردەوە.

الــــدُّخامیسُ: ئــــادەمیزادی ڕەشــــی کەتە ٥ شتی خراپ.

الــدِّخْماسُ: شــتی شــاردراوە، داپۆشــراو، ڕوکەشو تــەزویر ٥ دەگــوترێ: (ثنــاء دخْــــاس) پیاهەڵــــدانو مــــەدحی ڕوکەشو ناواقیعی.

الدَّخْمَسُ: ئەو کەسەی ئەوەی دەتــەوێ بۆت ڕون بکاتەوە ئەنجامی نادا.

الدَّخْمَسَةُ: بەمانا (الدَّخْمَسُ) دێ.

الْمُدَخْمَسُ: ڕوکــەش ٥ دەگــوترێ: (ثنــاء مُدَخْمَسٌ).

دَخَنَــت النــار دخنــاً ودخونــاً ودخانــاً: ئاگرەکە دوکەڵی کرد.

**دَخَنَتْ الوقود**: سوتەمەنییەکە دوکەڵی کرد.
**دَخَنَ الغبار**: تەپو تۆز بەرپابوو.
**دَخِنَتْ النار دخناً**: بەمانا (دَخَنَتْ) دێ.
**دَخِنَتِ الفِتْنَةُ**: فیتنەو ئاشوب دەرکەوت.
**دَخِنَ الطعامُ والشرابُ**: خواردەمەنییەکە دوکەلاوی بووە بۆنی دوکەڵی لێ دێو تامو بونو بەرامی تێکداوە.
**دَخِنَ الخُلُقُ والعقلُ والدينُ**: ڕەوشتو عەقڵو دین گەندەڵ بوو، تێك چوو.
**دَخُنَ الشَيْءَ دُخْنَةً**: بەمانا (دَخِنَ).
**أدخَنَت النارُ**: ئاگرەکە دوکەڵی کرد.
**دَخَّنَتْ النارُ**: بەمانا (دَخَنَتْ) دێ ٥
**دَخَّنَ الوقود**: سوتەمەنییەکە دوکەڵی کرد.
**دَخَّنَ على الشَيْءَ**: وای کرد دوکەڵەکەی بگاتە شتەکە.
**دَخَّنَ على الشجر أو على الثوب**: درەختەکە یان قوماشەکەی بەبخورێکی تایبەتی پاك کردەوە ٥ نەخۆشیو بەکتریای پێوە نەهێشت.
**دَخَّنَ التَبغ**: ئاگری بەتوتنەکەوە ناو دوکەڵەکەی هەڵمژی.
**أدْخَنَتِ النارُ**: بەمانا (دَخَنَتْ) دێ ٥
**أدْخَنَ فلانٌ**: فلانکەس دوکەڵی مێشوولە کوژوشتی وای بەرپاکرد بۆ پاککردنەوەی دەوروبەرو بۆنخۆشکردنی.
**ادْخَنَ الزرعُ**: کشتوکاڵەکە پێگەیو ڕەنگی وەکوو ڕەنگی دوکەڵی لێ هات.
**تَدَخَّنَ**: بۆ موطاوەعەی (دَخَّنَهُ) دێ.
**تَدَخَّنَ القِدرُ**: دیزەکە دوکەڵی لێ بەرز بووە دوکەڵ دایپۆشی.
**تَدَخَّنَ فلان**: فلان جگەرەی خوارد، دوکەڵی کرد.
**الداخِنَةُ**: دوکەڵکێش بۆ کورەخانەو تەندورو سەماوەرو ئەو جۆرە شتانە.
**الدخان**: دوکەڵ ٥ ئەو شتە وردیلانە لەئاگر بەرز دەبنەوەو دوکەڵ پێك دەهێنن . توتن.
**الدُّخان**: بەمانا (الدُّخان) دێ ٥ واتە: دوکەڵ.
**الدُّخْنُ**: ڕوەکێکە لە پێری (النجلّيات)٥ بەرەکەی بچووكو لووسە وەکوو کونجی لەناو زەوی کشتوکاڵدا دەروێندرێو خۆڕسکیشە.
**الدُّخْنُ**: دوکەڵ، حیقدو کینە، دەگوترێ: (بينهما دَخَنٌ) ٥ لە نێوانیاندا حیقدو کینە

هەیە ە هەروا دەگوترێ: (هدنة علی دَخَنٍ) ڕێك كەوتنو ئاشتەوایی لەسەرشتی بێ بنەماو فەسادو داوەشاوی نێوان ە هەروا دەگوترێ: (فی متن السیف دَخَنٌ) شمشێرەكە ئەوەندە صافو پاكە رەش دەنوێنێ ە

**الدُّخَانُ**: ئەوەیە دوكەڵاوی بێو دوكەڵ دایپۆشیبێو رەنگی دوكەڵی گرتبێ، تەپو تۆزاوی ە دەگوترێ: (یوم دَخَانٌ) رۆژێكی تەپو تۆزاویو گەرمە.

**الدُّخنان**: جۆرە چۆلەكەیەكە.

**الدُّخْنَةُ**: ئەو شتەی كە عەترو قۆلۆنیای پێ دەپرژێندرێ ە دوكەڵو پف كراوێكی تایبەتییە دەرشێندرێ بۆ لەناوبردنی بەكتریا.

**أبو دُخْنَةُ**: باڵندەیەكە رەنگی وەكو رەنگی دوكەڵ وایە.

**المِدْخَنَةُ**: كورەخانە، دوكەڵ كێش ە (ك: مَدَاخِن).

**الدَّخْنَسُ**: ئادەمیزاد یان ئاژەڵی قەڵەوو بەهێز.

**الدَّاخی**: تاریك ە دەگوترێ: (لیل داخٍ) شەوێكی تاریك.

**الدُّخَی**: تاریكایی.

**الدُّخْیاء من اللیالی**: شەوی تاریكو تونەك.

**الدَّیْدَبُ**: چاودێر، سیخوڕ ە پیشەنگ ە كەرەكێوی.

**الدَّیْدَبانُ**: چاودێر، جاسوس پێشەنگ.

**الدَّدان**: چاو چنۆكو تێر نەخۆر ە شمشێر.

**الدَّدَنُ**: گاڵتەو گەپ.

**الدَّیدان**: دابو نەریت.

**الدَّیْدَنُ**: بەمانا (الدَّیدان) دێ ە دەگوترێ: (فلان دیدنه أن یفعل كذا).

**الدَّدا**: گاڵتەو گەپ.

**الدَّدُ**: بەمانا (الدَّدا) دێ ە

**دَرَأَ دَرْءاً ودُرُوءاً**: لاربوو، خواربوو.

**دَرَأَ البعیرُ**: حوشترەكە توشی نەخۆشی غوددە بوو ە غوددەی حوشترەكە هاوسا.

**دَرَأَ السیلُ**: لافاوەكە هەڵسا ە لەپەندی پێشینان دا هاتووە: (صادف درأ السیل درء یدفعه) شەڕو نەگبەتییەكە تووشی شەڕو نەگبەتیەكی تر بوو (ماری مارخۆر پەیدا بوو) توشی گونڕەشی خۆی بوو.

**دَرَأَ علیه**: لەناكاو لێی پەیدا بوو هێرشی كردە سەر

**دَرَأَ الكوكبُ**: ئەستێرەكە لەخۆر هەڵاتەوە بەرەو خۆرئاوا كەوتەڕێ ە درەوشایەوەو پرشنگی دا.

دَرَأت النارُ: ئاگرەکە روناکی دا.

دَرَأَ فلان درءاً: فلانکەس شتێکی کردە بیانوو خۆی شاردەوە ە دێوجامەی گرتەوە.

دَرَأَ الشَّيءَ وبه: شتەکەی رەتکردەوە، پاڵی پێوەنا ە لێی دورخستەوە لە حەدیثدا هاتووە: (إدْرَءُوا الحدودَ بالشبهات) بیانوو بۆ ئەنجام نەدانی حەد بدۆزنەوە حەدەکە ئەنجام مەدەن.

دَرَأت المرأةُ زَوْجَها: ژنەکە بەکەیفو شادی هەڵس و کەوتی لەگەڵ مێردەکەی نەکرد ناچیزەیی کرد.

دَرَأَ الدريئةَ نحو الصيد: دیوجامەی خستە پێش خۆی و خۆی لەدواوە حەشاردا بۆ ئەوەی نێچیرەکە نەیبینێ.

دَرَأَ الشَّيءَ: شتەکەی رەت کردەوە ە بلاوی کردەوە.

أدرأت الناقةُ: حوشترەکە گوانی خۆی شلکردن بۆ ئەوەی شیریان لێ بێتە خوار ە شیری دا.

دَارَأَه: تەنگی پێ هەڵچنی ە پشی پشی کرد بۆ ئەوەی زیانی پێ نەگەیەنێ ە لە حەدیثدا هاتووە ە (كان يصلي فجاءت بهيمةٌ تمُرّ بين يديه فمازال يدارئها).

إدَّرَأَ: بیانووی پەیداکرد، دیوجامەی گرتەوە بۆ ئەوەی نێچیرەکە بگرێ.

انْدَرَأَ: بۆ موطاوعەی (دَرَأَ) هاتووە.

إنْدَرَأَ الحريقُ: ئاگر کەوتەوەو بلاوەی کرد.

إنْدَرَأَ عليه: لەنکاو لێی دەرکەوت.

تَدَارَءَا: کەوتنە بەربەرەکانی یەکتری ە کێشەیان تێکەوت.

إدَّارَأَ: بەمانا (تَدَارَأَ) دێ.

تَدَرَّأَ: بیانوی بۆ خۆی دۆزییەوە ە زێدەرۆیی کرد، خۆی بەزل زانی و تەکەببوری کرد.

اَلتُّدْرَأ: پاراستن و پارێزگاری.

اَلتُّدْرَأةُ: بەمانا (التُدرأ) دێ.

الـدَّرأ: لوتکەو دوندی کێو ە درزو کەندری رێگا ە خوارو خێچی رێگا.

الدُّرِيُّ: ئەستێرەی خۆشڕەو لە خۆرهەڵاتەوە بەرەو خۆر ئاوا بە پرشنگ و پرتەوەو دەڕوا.

الدريئة: دێوجامە، کەپک و کۆختە ە بازنەیەکە تێیدا فێری تیر هاوێژی و سەیارە لێخوڕین و شتی وا دەبێ.

المِدْرَأ: مەتاڵ، ئامێری بەرگری کردن.

الدَّرابزين: موحەجەرەی ئەملاو ئەولای پلیکان بۆ ئەوەی ئەو کەسە پێیدا سەردەکەوێ و دێتە خوار دەستی پێ بگرێ و لەکەوتنە خوارەوەش بی پارێزێ.

**دَرِبَ بِهِ دَرَباً ودُرْبَةً**: خۆی پێوەگرت‌و تێیدا راهات.

**دَرِبَ علی الشَّیْءَ**: بەشتەکە راهات‌و فێری بوو ○ (هو دارب، ودَرِبٌ هی داربة ودَرِبة وهو وهی دروب).

**أدْرَبَ**: چووە ناو کۆڵان‌و گەرەك‌و هۆبەوە.

**أدرَبَ فِي الغزو**: چووە سنوری دوژمنەوە ○ تەپڵی لێ دا.

**دَرَّبَ فلاناً بالشَّیْءَ وعلیه وفیه**: فلانکەسی فێرکردو لەسەر شتەکە رایهێنا.

**دَرَّبَ البعیرَ**: حوشترەکەی فێری ئەوەکرد بەناو کۆڵان‌و کون‌و کەلەبەردا بڕوا.

**تَدَرَّبَ**: بۆ موطاوعەی (دَرَّبَهُ) دێ.

**تَدَرَّبَ بالشَّیْءَ**: بەمانا (دَرِبَ) دێ ○

**الدَّارِبُ**: تەپڵ لێدەر (ألدَّارِبة:) ئافرەتی تەپڵ لێدەر.

**الدَّرْبُ**: تەنگەبەرو رێگای تەسك لەناو کێوو شاخدا ○ مەدخەلی تەنگەبەر ○ هەر رێگایەکی چوونە ژورەوەبێ بۆ ناو وڵاتی رۆم ○ هەر رێگایەك بۆ دەرەوەی شار بچێ ○ ئەو شوێنەی خورمای تێدا هەڵدەخرێ بۆ وشکبونەوە ○ (ك: دُرُوب وأدراب ودِرابٌ).

**الدُّرْبُ**: ماسی زەردی ئاڵتونی وەکوو ئەوە بە ئاڵتون روکەش کرابێ.

**الدُّرْبَةُ**: پرکێشکردنی هەر کارێك بێتە پێشەوە ○ ناوەڕاستی پشتی گاکێوی.

**ألْمُدَرَّبُ**: راهێنراوو مەشق پێکراو ○ توشبوو بەکارەسات.

**تَدَرَّباً**: خولایەوە.

**دَرْبَجَ**: دوای رەقبون‌و سەرکێشی نەرم‌و نیانی نواند ○ لارو لەنجەی کرد.

**الدُّرابِجُ**: خۆ بادەرو فیزکەرو لارو لەنجەکەر لە رۆیشتنی دا.

**دَرْبَحَ**: سەری شۆڕکردو پشتی کۆم کردەوە ○ لەترسا بازی هاویشت.

**دَرْبَحَ لە**: ملکەچی بوو، ژێربار بوو.

**دَرْبَخَ**: سەری شۆڕکردو پشتی کۆم کرد.

**دَرْبَخَ لە**: ژێرباری بوو، ملی کەچ کرد، بەزەلیلی‌و ملکەچییەوە گوێی بۆ راگرت.

**تَدَرْبَسَ**: چووە پێشەوە.

**الدُّرابِسُ**: ئادەمیزادی کەتەو زەبەللاح، ئاژەڵی گەورە.

**الدِّرْباسُ**: شێر ○ سەگی مێنکر.

**دَرْبَصَ**: لەترسا خۆی ماتدا.

**الدُّرابُکَةُ**: تەپڵی پچوك.

**الدَّرْبَکَةُ**: تێکەڵاوی‌و پاڵەپەستۆو قەرەباڵغی.

**دَرْبَلَ**: لەتەپڵی دا.

**دَرْبَلَ فِي مشیه**: بەئەسپایی‌و تەمبەڵی جوڵایەوە.

**الدَّرْبانُ**: دەرگەوان ◦ (ك: دَرَابِنة).

**الدِّرْبانِيـــة**: جــۆرە مانگايەكــە دوگــى هەيە.

**دَرَجَ دَرْجــاً ودُرُجــاً وَدَرَجانــاً**: جــۆرە رۆيشتنێكى ئەنجامدا وەكوو ئـەوەى بەپەيــژەدا ســەر بكــەوێ ◦ بەســەر زەوى‌دا رۆيى.

**دَرَجَ الصَّبِيُّ**: منداڵەكـە كەوتـە گاگۆڵـكێو دەستى كرد بەرۆيشتن.

**دَرَجَت الريحُ**: بايەكە بەهێواشـى هـەڵى كرد ◦ تەپو تۆزى هەڵساندو شوێنى لەلبەلاّن كرد.

**دَرَجَ فـــلان**: فلاّنكـــەس رێـــگاى خــۆى گرتەبــەرو ملــى لــەنێش نــا ◦ مــرد، لەپەنــدى پێــشیناندا هــاتووە دەڵــێ: (أكذب مــن دبّ ودَرَجَ) درۆزنـتریـن زیندوو مردووە.

**دَرَجَ القـــومُ**: نەتەوەكــە بنـــەبڕبوونو كەسيان نەما.

**دَرَجَ بينهم بالنمائم**: فيتنەيىو دوزمانى لە نێوان كردن.

**دَرَجَ الشَّيْءَ في الشَّيْءِ**: ئەو شتەى كردە ناو كونو كەلەبەرى ئەو شتەوە.

**دَرِجَ دَرْجاً**: بەردەوام بوو لەسەر خواردنى گۆشــت كــەو ◦ پابەنــدى بەڵــكەو رێبازى خۆى بوو لە بوارى ئاييندا. بەپەيــژەدا ســەركەوت ◦ بــەرێبازى خۆيــدا رۆيــىو كاروبــارى خــۆى لەئەســتۆ گــرت ◦ مــردو دونيــاى لەدەست چوو.

**أدْرَجَ الـــشَّيْءَ**: بـــەمانا (دَرَجَـــهُ) دێ ◦ فەوتانـــدىو لـــەناوى بـــرد، دەگوترێ: (أدرجَهُ اللّٰه) خودا لەناوى برد.

**أدْرَجَ الـــدَّلْوَ**: لەســەرەخۆ دۆڵـچەكەى داهێشتە خوار.

**أدْرَجَ فلاناً**: فلاّنكەسى نارد.

**دَرَّجَهُ**: شتەكەى پلە پلەكرد.

**دَرَّجَ البنـــاءَ**: پەيـــژەى بـــۆ باڵەخانەكـــە دروست كرد.

**دَرَّجَ فلاناً**: پلە پلە فلاّنكەسى لـەخۆى نزيك كــردەوە ◦ فلاّنكەسى راهێنـاو وردە وردە كەوى كرد.

**دَرَّجَ العليـــلَ**: وردە وردە نەخۆشـــەكەى هێنايـەوە سەر خواردنو كـەم كـەم خــواردنى دايــە تــا هاتــەوە تــايمى خۆى.

**دَرَّجَ الطعـامُ والأمـرُ فلانـاً**: خواردنەكـە بەجۆرێك بوو يان كارەكە وەهابوو دەبوايە فلاّن وردە وردە دەستى بۆ ببردنايە.

**إنْـــدَرَجَ**: بــۆ مــوطــاوەعــەى (دَرَّجَــهُ) هاتووە.

**إنْـــدَرَجَ عليـــه**: لــەخۆى گــرت، ئەويـشى

گرتەوە ٥ دەگوترێ: (اندرج تحته كذا أو فيه كذا) چووە ژێر خێمەی ئەوەوە چووە خانەی ئەوەوە.

تَدَرَّجَ: بۆ موطاوەعەی (دَرَّجَهُ) دێ.

تَدَرَّجَ اليه: وردە وردە چووە پێشەوە ٥ پلە پلە سەرکەوت.

اسْتَدْرَجَهُ: لە پلەیەکەوە بۆ پلەیەکی تر بەرزی کردەوە ٥ وای لێ کرد هەنگاو هەنگاو زەوی ببڕێ.

اسْتَدْرَجَ فلاناً: فلانکەسی لەخشتە بردو هەڵی نا ئەوکارە بکا.

استَدْرَجَ الريحُ الشَّيْئَ: هەوا وای لەشتەکە کرد بۆ خۆی رابدرێ بەبێ ئەوەی بەرزی کاتەوە بۆ حەوا.

استَدْرَجَ اللهُ العَبْدَ: پەروەردگار بەندەی خۆی مۆڵەت داو گوزوگومەمەت لەسەر تاوانەکەی نەیگرت ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿سَنَسْتَدْرِجُهُم مِّنْ حَيْثُ لاَ يَعْلَمُونَ﴾.

استَدْرَجَ الشَّيْئَ الى الشَّيْئَ: وردە وردە شتەکەی لەو شتە نزیك کردەوە.

الأُدْرُجَة: بەرزکەرەوە، پەیژە.

الدَّارِجَ: دەگوترێ: (ترابٌ دارِجٌ) گڵێکە شوێنەواری خانووەکەی دادەپۆشێ.

الدَّارِجَةُ: دوا بڕاو، دەگوترێ: (قبيلةٌ دارِجَةٌ) هۆزو خێڵێکی دوابڕاوو ریشەکێشکراوە.

الدَّارِجَة من الدابة: قاچەکانیەتی ٥ دەگوترێ: (هو قصير الدَوارج) ئەوگیانلەبەرە قاچ کورتە.

الدَّرْجُ: دەگوترێ: (نحن درج يديك) ئێمە لەژێر دەستی تودایین ٥ هەروا دەگوترێ: (أنفذتُهُ في درج كتابي) ئەو شتەم خستۆتە ناو دوتوێی کتێبەکەمەوە.

الدُّرْجُ: صندوقێکە شتی تێدا دادەنرێ پێی دەگوترێ پەغدان ٥ لەئەصڵدا ئەم جۆرە صندوقە تایبەتە بە ئافرەتەوە هەندێ جلو شتومەکی تایبەتی خۆی وەکوو خشڵو شتی پێداویستی مەکتەبی تێدەخرێ.

الدَّرَجُ: بەمانا (الدُّرْج) دێ ٥ ڕێگا ٥ دەگوترێ: (رَجَعَ فلان دَرَجَهُ وادْراجَهُ) فلانکەس بەرێگای خۆی دا گەڕایەوە، چۆن هاتبوو ئاوا رۆیشتەوە ٥ هەروا دەگوترێ: (ذهب دمُهُ دَرَجَ الرياح): خوێنەکەی بەفیڕۆ چوو ٥ (هو درج بين المتخاصمين): ئەو شالیارو ناوەندە لە نێوان ئەو دوو کەسەی کێشەیانە ٥ (ك: أداج).

الدُّرَجَةُ: بەمانا (الدُّرجُ) دێ.

الدَّرجة: پلەی سەرکەوتن، پلەو

پایە ٥ دەگوترێ: (لە علیه دَرَجَة) پلەو پایەی لەو بەرزترە ٥ وشەی (دَرَجَة) لە زاراوەی ئاسمانـــشوناسی دا بەشێـــکە لەسێ سەدو شەصت بەشی سوڕانەوەی فەلەك ٥ لەزاراوەی ماتماتیکدا بەشێکە لەنەوەد بەش.

دَرَجَة الحرارة: بەشێـکە لـە بەشـەکانی پێـــوەری تایبـــەتی بەکـــەش‌و هەوا ٥ (ك: دَرَجٌ ودَرَجان).

الدُرَّجَة: کـورکی: جـۆرە باڵندەیەکـە دیـوی دەرەوەی باڵـەکانی خاکییـە، دیوی ناوەوەی رەشە، لەقەتی دەچێ وەلێ لەو جوانترە.

الدَّرَاجُ: هێتنەو دوزمان ٥ ژیشك.

الـــدُرَّاجُ: کـــەو ، جـۆرە باڵندەیەکـە لەرۆیشتنی دا خۆی دەلەنگێنێ.

الدَّرَاجَـةُ: بایـسکیل‌و رەورەوەی منـداڵ کـە لەســـەرەتای فێرەرۆیـــشتنی دا بـــەکاری دەهێنـــێ ٥ پایـــسکیل کـــە دوتایـەی لەژێردایـە بـە جوڵانـدنی قـــاچ هەڵدەســـوڕێ یـــان بـــەوزەو ســـوتاندن دەڕوا ئەوکاتـــە پێـــی دەگوترێ ماتۆڕ.

الـــدُرْجُ: تـــەنگو چـــەڵمەی وەهـــا ئـــادەمیزاد لـــە پـــەل‌و پـــۆ بخـــا، دەگـوترێ: (وقـع فـلان في الـدُرّج) فلانکـــەس کەوتۆتـــە نـــاو تەنگانەیەکەوە لێی رزگار نابێ.

الـدُرْبج: ئامێرێـکی موسـیقایە وەکـوو تەنبور.

الدُّروج: خۆشڕەوو تیـژڕەو، دەگـوترێ: (سهم دروج) و(ریح دروج).

المِـدْراجُ: ئـەو شـتەی زۆر شـت لـەناو بەرێ.

الْمَـــدْرَجُ: رێبـــازو مەســـلەك ٥ بـــیرو بۆچوون.

مَدْرَج النمـل: رێچکەی مێـرو ٥ رێـگای پێچاو پێچ ٥ (ك: مَدَارج).

الْمُدْرَجُ: لـە زاراوەی عیلمـی حـەدیثدا بە حـەدیـسێك دەگـوترێ: وشـەیەك یـان رسـتەیەك بخرێتـە نـاو دەقـی حەدیـــسەکەوە، راوییەکـــە ئـــەو تێهەڵکێـشییە دەکـاو ئـەو کەسـەی دەی بیـــسی وا دەزانـــی حـەدیـــسی مەرفوعە.

الْمَدْرَجـة: رێـــڕەوی شـتەکان لەســـەر رێـــگا ٥ خـــودی رێـــگا ٥ سەرەرێـــگا، دەگـــــوترێ:(اتخـــــــذوا دارَهُ مدرجة)٥ زوربـەی رێـگا، دەگـوترێ: (هذا الأمر مَدْرَجـة لـذاك) ئـەم کـارە زۆرینــەی رێــگای ئــەو شـتە نزیـك دەکاتەوە. ٥ ئەو بەڕەی نامـەی تێـدا دەنووسـرێ ٥ یـان نـاوی کتێبـی تێـدا تۆمار دەکرێ.

**الْمَدْرَجَةُ مِـن الأرض**: زەوییـەك كـەوی زۆر تێدابێ.

**اَلْمُـــــدَرَّجُ**: شوێنێـــــك كورســـــی دانیشتنەكەی خوارو ژووربـن واتـە: تـا كورسـییەكان زیـاتر لـە دواوەبـن شوێنەكەیان بەرزتربێ.

**دَرَحَهُ دَرْحاً**: پالی پێوەنا.

**دَرِحَ دَرَحـــاً**: پـیر بـوو، بەتـەواوی پـیر بوو ◦ (فهو وهی دَرِح).

**دَرَدَ دَرداً**: هەموو ددانەكانی كەوتن.

**دَرِدَت الناقة**: حوشترەكە بـەهۆی پیری هەموو ددانەكانی كـەوتن ◦ (هو أَدْرَدُ وهي دَرْدَاءُ) (ك: دُرْدٌ).

**أَدْرَدَهُ**: ددانەكانی خستن.

**الدُرْدِيُّ**: ئـەو خلتـەو پلتـەی دەكەوێتـە بنـەوەی جامـە هـەنگوینو تەنەكـە رۆنو هەر شلەمەنییەكی تر.

هـەروا خـەمیرە كـە لەسـەر میـوە گوشراوەكە دەهێڵدرێتەوە بۆ ئەوەی بەتەواوی گۆڕانی بەسەردا بێ.

**دَرْدَب الطبلُ**: تەپڵەكە دەنگی لێوە هات.

**دردَب فـــــلان**: فلانكـــەس بـــازی ترسنۆكانەی هاویـشت، هـەر دەڕواو بـاز دەهـاوێو بەحـەزەرەوە سـەیری ئەم لاو ئەولای خۆی كـرد ◦ زەلیـلو كەردنكەچ بوو.

**الدَرْدَابُ**: رەنگی تەپڵ.

**الـــدَرْدَبُ**: دەگـــوترێ: (إمـــرأة دَرْدَبٌ) ئافرەتێـكە بەشەو دێو دەچێ.

**الـــدُرْدِبِيّ**: تـــەپڵ كـــوت ◦ ئـــەو كەســـەی تەپڵی پچوك لێ دەدا.

**الـــدَرْدِبِيسُ**: پیرەمێـردو پیرەژنـی كۆنـە ســالٌو پۆڵـــكاوو كەنـــەفت ◦ بـــەڵاو كارەسـات ◦ میرویەكـە ژنـە عـەرەب پێیـــان وابـــوو بـــەكار هێنـــانو لەملكردنی دەبێتە هـۆی دەستەبەر بـوونی خۆشەویـستی مێردەكانیـان بۆیان.

**الـــدَرْدَحُ**: پـیرەژنو پیرەمێـردی پۆڵـكاو كـە ددانیـان نـەمابن ◦ كەسێـك زۆر خویداتـە شتێـكو حـەزی لێ بكـا ◦ (ك: دَرَادِحَ).

**الدَرْدِحَة**: ئافرەتێـك درێژیو پانی وەك یەك بن.

**دَرْدَرَ الماءُ**: ئاوەكە هەڵقوڵاو كفەی كرد.

**دَرْدَرَ التَمْــرَةَ وغيرهـــا**: بـــە پوكـــەكانی خورماكەی سووەوەو جوی.

**تَـــدَرْدَرَ**: بـــۆ مـــوطـــاوعـــەی (دَرْدَرَهُ) دێ ◦ كەوتە جمەو جوڵو راتەكان.

**الـــدُرْدارُ**: دەنگـــی تـــەپڵ ◦ درەختێـــكی گەورەیـــە گوڵێـــكی زەردو بەریـــشی هەیە، بۆ جوانی لەمبەرو ئەوبـەری رێـگا دەروێنـدرێ سێبەری باشیـشی هەیە.

**الدُرْدُرُ**: پوك، شوێنی ددان كه ددانه‌كان نه‌مابن.

**الدُرْدَري**: كه‌سێك هه‌ر بێ‌و بچێ‌و كارێكی دیاریكراوی نه‌بێ.

**الدُردورُ**: شه‌پۆلی ده‌ریا كه ترسی ئه‌وه‌ی لێ بكرێ ببێته هۆی خنكاندنی ئه‌وانه‌ی له‌ناوی‌دان.

**الدَرْدَشَةُ**: غاڵ‌و بوغڵ‌و هه‌راو هۆریای خه‌ڵك‌و قسه‌ی زۆر.

**الدَرْدَاق**: ته‌پۆڵكه‌یه‌كی بچوك‌و ره‌قه‌ڵانه كه هه‌ڵیده‌كه‌نی لبه‌ڵان ده‌رده‌كه‌وێ.

**الدَرْدَقُ**: شتی بچوك له هه‌رشتێك بێ ٥ ده‌گوترێ: (وِلدان دَرْدَق ودرادق).

**الدِرْدمُ**: ئافره‌تێك به‌شه‌و هه‌ر بێ‌و بچێ ٥ حوشتری پیر ٥

**دَرَّ**: زۆر بوو، ده‌گوترێ: (دَرَّ الدَمْعُ والبولُ) زۆری فرمێسك هه‌ڵرشت ٥ زۆری میزكرد.

**دَرَّ الدنیا علی أهلها**: خێرو بێری دونیا زۆربوو.

**دَرَّ الخراجُ**: ده‌یه‌ك‌و خه‌راجی ئه‌و ولاته زۆر بوو.

**دَرَّ كل حلوب باللبن**: شیرده‌ره‌كه شیری زۆری دا ٥ ده‌گوترێ: (دَرَّت حلوبة البلد): خه‌راج‌و ده‌یه‌كیان زۆربوو.

**دَرَّ النبات**: گیاو گژه‌كه تێك چرژا.

**دَرَّ العرقُ دَرّاً ودروراً**: عه‌ره‌قه‌كه ره‌وان بوو ٥ فواره‌ی كردو هه‌ڵچوو.

**دَرَّ السماءُ بالمطر**: ئاسمان بارانی زۆری باراند.

**دَرَّ العِرقُ**: ره‌گه‌كه پڕبوو له خوێن.

**دَرَّ الضِرعُ**: گوانه‌كه پڕبوو له شیر.

**دَرَّ باللبن**: شیری زۆری دا.

**دَرَّ السوقُ**: بازاڕ بره‌وی په‌یدا كردو مامه‌ڵه‌ی زر تێداكرا.

**دَرَّ السراجُ**: چراكه روناكایی دا.

**دَرَّ جِسْمُهُ**: جه‌سته‌ی نه‌خۆشی پێوه نه‌ماو جوان بۆوه.

**دَرَّ الفرسُ**: ئه‌سپه‌كه بازێكی یه‌ته‌وژمی هاویشت یان چه‌ند بازێكی یه‌ك له دوای یه‌كی به‌شێنه‌یی هاویشتن.

**دَرَّ وجهه دَرَراً**: دوای نه‌خۆشی جه‌سته‌ی جوان بۆوه.

**أدَرَّ**: شیری زۆر بوو، كاری باشی زۆر بوو.

**أدرّت الناقةُ بلبنها**: حوشتره‌كه شیری زۆری دا.

**أدَرَّ الفرسُ**: به‌مانا (دَرَّ) دێ.

**أدَرَّ الشَيْئَ**: شته‌كه‌ی وه‌جم‌و جوڵ خست ٥ ده‌گوترێ: (بین عینیه عِرْقٌ یُدِرُّهُ الغَضَبَ) له‌نێو چاوانی دا ره‌گێك هه‌یه رق هه‌ڵسان ده‌یهێنێ‌و ده‌یبا.

أدَرَّ المِغزَلَ: تەشییەکەی باداو سوڕی پێداو بینی پێ گرت بەجۆرێك هەردەلێی ڕاوەستاوە.
أدَرَّ الناقةَ ونحوها: دەستی بەگوانی حوشترەکەدا هێنا بۆ ئەوەی شیر بدا.
أدَرَّ الریحُ السحابَ: بایەکە هەوری کوکردنەوە.
أدَرَّ الدواءُ البولَ: دەرمانەکە وای کرد زۆر میزبکا.
أدَرَّ فلان حاجته: فلانکەس زۆر هەوڵی دا بۆ ئیشەکەی تا دەستەبەری کرد ٥ (فهو وهی مِدرّ وهی مَدِرَّة ایضا).
اسْتَدَرَّ اللبن والدمع ونحوهما: بەمانا (دَرّ) دێ، واتە: زۆر بوو.
اسْتَدَرَّ الناقةُ: حوشترەکە حەزی لە کەڵدان بوو، فەوچاندی.
استَدَرَّ المحلوبَ: داوای شیری لێ کرد، ویستی بیدۆشێ.
استدرَّ الریحُ السحابَ: بەمانا (أدرّته) دێ.
استدرَّ البولَ: شتێکی خوارد زوو میزبکا، زوو میزی بێ،
الدَارُّ: بەردەوام ٥ دەگوترێ: (رزق دارّ) رزق‌و ڕۆزییەکی بەردەوامە نابڕێ (ك: دُرّار، ودُرُرّ، ودَرَّر).
الـدَرُّ: شیر، یان شیری زۆر ٥ نەفس ٥ کاری باش لە مەدحکردنی کەسێك دەگوترێ: (لله درّهُ) هەر بۆ خودایە پاداشی چاکەی ئەو بداتەوە بەکەسی تر ناکرێ ٥ هەروا دەگوترێ: (دَرّ درُّهُ) خێرو بێری زۆر بوو.
الـدَّرَرُ: دَرَر الریح: بەرەو با، شوێنی هەڵکردنی با.
دَرَرُ الطریق: نامانج‌و مەبەستی ڕێگا، دەگوترێ: (هم علی دَرَرٍ واحد) ئەوانە یەك مەبەست‌و نیازیان هەیە ٥ (داری بدرر دارك) ماڵەکەم بەرامبەر ماڵی تۆیە.
الـدُّرَارُ: تاکی (الـدُّرّ)ە ٥ واتە دەنکە لوئلوئی گەورە ٥ بەبەغای پچوك ٥ (ك: دُرَرٌ).
الدِّرَّةُ: شیر یان شیری زۆر ٥ دەگوترێ: (للسحاب دِرَّة) هەورەکە ڕێژنەی بارانی هەیە ٥ ئاو زەنگی ٥ ڕەواجی کالا، دەگوترێ: (للسوق دِرَّة)٥ هەروا دەگوترێ: (مرّ علی دِرَّتِهِ) ڕاست ڕۆیی‌و لای نەدا هیچ شتێك نەیگێڕایەوە ٥ هەروا بەمانا (قەمچی) دێ.
الـدُّرِّي: دوڕ ئاسا وەك دوڕ وایە لە جوانی‌و درەوشاوەیی دا ئەستێرەی گەشە داری ڕوناك ٥ (ك: دُراری).

**الـدُّرِيرُ**: جەستەو ئەندام رێكو پێك، خێراو خۆشڕو روناككەرەوەو شوعلەدەر.

**المِدْرارُ**: زۆر رژێنەر، پڕخێرو بێر، دەگوترێ: (سحاب مِدْرارٌ) هەوری بەریژنە باران، (عين مدرار) چاوی فرمێسكاوی فرمێسك رێژ بەزۆری.

**المِدَرّة**: تەشی، (ك: مَدَارٌ).

**دَرِزَ دَرَزاً**: نازو نیعمەتی دونیای بۆ دەستەبەر بوو.

**الـدُّرْزُ**: شوێنی دورمانكردن، نازو نیعمەتی دونیا، (ك: دروز) (أم دُرْز) كونیەی دونیایە.

**الـدُّرْزَةُ**: (أولاد درزه) خەیاتەكان (بەرگدرووەكان)، هەتیوەچەو خوێڕیو باوك نەناسراو.

**الدُّرْزِيُّ**: بەرگدرو.

**الدُّرْزِيـة**: تاقمو پێڕێكن لەشیعەی ئیسماعیلی خۆیان پاڵ (أبو محمد عبد الله الفاطمي) دەدەن.

**دَرَسَ درساً ودروساً**: پوكایەوەو نەماو شوێنەواری گوم بوو، زەمەنو كاتی بەسەر چوو.

**درس الثَّوبُ**: پۆشاكەكە كۆن بوو داڕزا، رۆژگاری زۆری بەسەردا تێپەڕی.

**دَرَسَ البعيرُ**: حوشترەكە گروێ بوو.

**درست المرأة**: ئافرەتەكە كەوتە عادەی مانگانەی خۆیەوە، (فهي دارس)، (ك: دُرَّسٌ ودوارسُ).

**دَرَسَ الشَّيْءَ درساً**: شتەكەی گۆڕیو شوێنەوارەكەی نەهێشتەوە.

**دَرَسَ الثَّوبَ**: پۆشاكەكەی كۆن كردو رزاندی.

**دَرَسَ الدابَّـةَ**: وڵاخەكەی ژێر باركردو زەلیلی كرد.

**دَرَسَ الفِراشَ**: جێگای داخستو چووە سەری نوست.

**دَرَسَ الكتابَ ونحوه درساً ودراسةً**: كتێبەكەی خوێندەوەو هەوڵی دا لەبەری بكاو فێری ببێ، دەگوترێ: (درس العلم والفَنَّ).

**دَرَسَ الحنطةَ**: گەنمەكەی گێرەكرد.

**دَرَسَ الطعامَ**: بەخێرایی خواردنەكەی خوارد.

**أدْرَسَ الكتابَ ونحوه**: بەمانا (دَرَسَهُ) دێ.

**أدْرَسَ فلاناً الكتابَ ونحوه**: وای لە فلانكەس كرد كتێبەكە بخوێنێتەوەو دیراسەی بكا.

**دارَسَ الكتابَ ونحوه مدارَسَةً ودراساً**: بەمانا (دَرَسَهُ) دێ.

**دارَسَ فلاناً**: شتەكەی بۆ فلانكەس خوێندەوەو ئەویش بۆ ئەوی

خوێنــــدەوەو وەبـــیری یـــەكتریان هێنایەوە.
دارَسَ الذنوبَ: تاوانەكانی ئەنجام دان.
درّسَ الكتابَ: بەمانا (دَرَسَهُ) دێ٥
درّسَ الـبعيرَ: حوشـترەكەی رامكـردو رایهێنا ٥ دەگوترێ: (بعير لم يدرّس) حوشترێـكە ژێربـار نـەكراوە، رانـە هێنراوە ٥ سواری نەبوون.
دَرَّسَــتِ الحــوادثُ فلانــاً: روداوەكــان فلانكەسیان لەبۆتە داوە.
دَرَّسَ الكتــابَ فلانــاً: نــاوەرۆكی كتێبەكـەی بـۆ فلانكـەس شـی كردەوەو تێی گەیاند.
إنــدَرَسَ: بــۆ موطــاوەعــەی (دَرَسَ) هاتووە.
تَــدارَسَ الكتــابَ ونحــوَهُ: كتێبەكـەی خوێندەوەو پێی داچۆوەو لێی ورد بۆوە هەوڵی دا لەبەری بكاو لـەیادی نەچێتەوە.
تــدارسَ الطلبــةُ الكتــابَ: هەریـەك لەقوتابییــەكان كتێبەكـەیان بــۆ یەكتر خوێندەوەو بـۆ ئـەوەی تێـی بگەن‌و لەبیریان نەچێتەوە.
ادّرَسَ الكتابَ ونحوه: بەمانا (تَدارَسَهُ) دێ.
تَدَرَّسَ: بۆ موطاوەعەی (درّسَهُ) دێ.
تَدرَّسَ فـلان: فلانكـەس پۆشـاكی كـۆنی پۆشی.
الدَّرْسُ: رێـگای كوێرەوەبوو ٥ بەشێـك لـە زانیـاری لەكاتێـكی دیـاریكراودا دەخوێندرێ ٥ (ك: دروس وأدراس).
الـدِّرْسُ: پۆشـاكی رزیـوو كـۆن ٥ كلكـی حوشتر (ك: أدراس، درسان).
الدُّرسةُ: وەرزش‌و پێداچونەوەی وانە.
الـــدِّرْواسُ: كەللـــەزل ٥ ســـەگی سـەرزل ٥ حوشـتری رامكـراوی مـل ئەستور ٥ پیاوی ئازا ٥ شێر.
الدِّرْياسُ: بەمانا (الدِّرواسُ) دێ.
الدَّرِيسُ: شتی لێكۆڵینەوە لەسەركراو، خوێنـــدراو ٥ پۆشـــاكی كـــۆنی رزیـو ٥ كلكی حوشـتر ٥ (ك: أدراس ، ودرسان).
الدَّرِيــسَةُ: چـــاككردنەوەی رێـــگای شــــەمەندەفەر ٥ كرێـــــكاری چاككردنەوەی رێگای شەمەندەفەر.
اَلمِدْراسُ: ئـەو شوێنەی لێـكۆڵینەوەی نامـە ئاسمانییـەكانی تێـدا ئـەنجام دەدرێ، ئــەو شــوێنەی نــاوەرۆكی تەوراتی تێدا شی دەكرێتـەوە نـاوی (مِـدْراس)ە (مِـدْراس اليهـود)٥ ئـەو كەسـەی شـەرحی تـەورات دەكـا بـۆ جولەكەكان ٥ بۆیە لە حەدیثی ئـەو جولەكـەی زینـای كردبـوو هـاتووە دەڵێ: (فَوَضَعَ مِدْراسُها كَفَّهُ على آيـة الرجم) ٥ (ك: مداريس).

اَلْمُـــدَرِّسُ: ئـــەو كەســـەی زۆر دەرس بلّێتـــەوەو زۆر بخوێنێتـــەوە زۆر لـــە كتێبان بڕوانێ، مامۆستاو وانە بێژ.

اَلْمَـــدْرَسُ: شـــوێنی دەرس گوتنـــەوەو دەرس خوێندن.

اَلْمَدْرَسَـــةُ: خوێنـــدنگاو قوتابخانـــە، شـــــوێنی خوێنـــــــــدنو فێربـــوون ٥ كۆمەڵێـــك فەیلەســـوف، یـــان رۆشـــنبیرو بیرمەنـــد یـــان لێـــكۆڵەرەوە كـــە بـــیرو رایـــەكی تایبـــەتییان هـــەبێو بۆچـــونیان هاوبـــەش بـــێ، دەگـــوترێ: (هـــو مـــن مدرسة فلان) ئەوە لەسەر مەزهەبو رێبازی فلانە.

اَلْمَدْرُوسُ: شێت.

دَرْوَشَ: كرداری دەروێشانەی كرد.

تَدَرْوَشَ: بەمانا (دَرْوَشَ) دێ.

الدرويش: لەزاراوەی صۆفیاندا كەسێكە دونیا نەویستو خودا پەرست بێو كەشـــكۆڵ هەڵـــگرێ بەجیهانـــدا بگەڕێ ٥ (ك: دراويش).

دَرِصَت الناقةُ ونحوها دَرَصاً: حوشـترەكە پیربـوو لەبـەر پـیری ددانـی شـكاون (هي درصاء)٥ (ك: دُرصٌ).

الـدِّرْصُ: بێـچوە مـشك، بێـچو جـرج، بێچوە ژیشك، بێچوە پشیلە، بێچوە كەروێـشك، توتەڵـە سـەگ، بێـچوە گورگ ٥ (ك: ادراص ودروص).

الدَّرْصُ: بەمانا (الدِّرصُ) دێ.

أم أدراص: كونـــە مـــشكو كونـــە جـرج ٥ بـەڵاو كارەسـات ٥ حوشـتری خێرارۆ ٥ (ك: ادراص ودروص).

الدَّروصُ: حوشتری خێرارۆ.

دَرَعَ الذبيحة درعـاً: كوشـتییەكەی لەلای ملییەوە گرو.

دَرَعَ الرقبـةَ: گـردە ملی كوشـتی یەكـەی هەڵكەند.

دَرَعَ في عنقـــه حـــبلاً: پەتێـكی لـەملی خستو خنكاندیو خنكا.

دَرِعَـت الفَـرَسُ والـشاةُ ونحوهـا دَرَعـاً ودُرْعَـــةً: ئەســـپەكە، مەڕەكـــە لای پێـشەوەی ڕەشو دواوەی سـپی یـان بـە پێـچەوانەوە (هـــو أدرع وهـــی درعاء) ٥ (ك: درع) دەگـوترێ: (ليلـة درعاء) سەر لەئێوارەی تاریك دوایی مانگەشەو (ئەمە ئەگەر لە كۆتـایی مانگـدابێ) یـان بـە پێـچەوانەوە سـەرلەئێوارە ڕونـاكو مانگەشـەو، دوایی تاریـك تونـەك (ئەمـە ئەگەر لەسەرەتای مانگ دابێ).

دَرِعَ الزرعُ: زرعاتە كە نیوەی خورا.

دُرِعَ الماءُ: هـەموو لەوەڕو پاوانی دەوری ئاوەكە خورا.

أدْرَعَ الشهرُ: مـانگ لـە چواردەو پانزە

تێپەڕی کەشەوەکانی سەر لە ئێوارە تاریك دەبن.

أدْرَعَ الزرعُ والماءُ: بەمانا (دَرِعَ) دێ.

أدْرَعَ القومُ: لەوەڕو پاوانی دەوروبەری ئاوەکانی ئەو خەڵکە دەرکەوت.

أدْرَعَ الشَّيْءَ: شتەکەی خستە کلۆرایی شتێکی ترەوە.

دَرَّعَ في السير: لە ڕۆیشتندا پێشکەوت.

دَرَّع فلاناً: فلانکەسی خنکاند، یان ملی خستە نێوان قۆڵو باسکی خۆیەوەو خنکاندی ○ پۆشاکی زرێی لەبەرکرد..

دَرَّع المرأةَ: پۆشاکی ناوماڵی بەئافرەتەکە پۆشی.

دَرَّعَ الرجلُ: پیاوەکە زرێی لەئاسن چنراوی لەبەرکرد.

ادَّرَعَت المرأةُ: ئافرەتەکە پۆشاکی ناوماڵی پۆشی، دەشگوترێ: (ادَّرَعَ الدِرْعَ).

إدَّرَعَ الليلَ: چووە ناو تاریکایی شەوەوە ○ لەپەندی پێشینانـدا هاتووە (شَمَّرَ ذيلا وادَّرع ليلا) ○ بڕیاری داو قۆڵی لێ هەڵکردو شەوی کرد بە قەڵاو زری بۆ ئەنجامدانی کارەکەی.

إنْدَرَعَ البطنُ: ورگی پڕ بوو.

إندَرَعَ العظم من اللحم: ئێسقانەکە لە گۆشتەکە داماڵدرا.

إندرع القمرُ من السحاب: مانگ لەهەورەکان دەرچوو.

إندَرَعَ فلان في السير: فلانکەس لە ڕۆیشتندا پێش کەوت ○ دەشگوترێ: (اندرع يفعل كذا) لێبڕا بۆ کردنی ئەو کارەو سوورە لەسەر ئەوەی بیکا.

تَدَرَّع الدِرْعَ: زرێی پۆشی.

تَدَرَّع الليلَ: چووە ناو تاریکایی شەوەوە.

تَمَدْرَعَ: فەرمنجی لەبەر کرد؛ پۆشاکێکە لە خوری دروست دەکرێ.

الدّارِعُ: ئەو کەسەی زرێی پۆشیبێ.

الدُّراعَةُ: پۆشاکێکە لەخوری دروست دەکرێ، جبەیەکە لای پێشەوەی کراوەیە.

الدِّرْعُ: زرێ لە شێوەی کراسدا لە ئەڵقە ئەڵقەی ئاسن دەچندرێو بۆ خۆپارێزی لە برینداربوون بەچەك لەبەردەکرێ ○ هەروا ناوە بۆ کراسی ئافرەت کە لەماڵەوە لەبەری دەکا ○ (ك: أدراع وأدْرُع ودروع).

الدُّرَعُ: شەوانی شانزەو حەڤدەو هەژدەی مانگی قەمەری ○ لەم ڕووەوە ئەم شەوانە سەر لە ئێوارەیان

**الرُّزنامة**: رۆژنامە، نامیلكەیەكی بچوك كـە زانیـاری رۆژانـەو هەفتانـەو مانگانە لـەخۆبگریٚ ٥ بـەڕێوەبردنی دابەشـكردنی موچـە بەسـەر موچـە خۆران دا.

**رَسَبَ في الماء رسباً ورسـوباً**: چووە بنكی ئاوەكە.

**رَسَبَ التلميذ**: قوتابییەكە لەتاقیكردنـەوەدا دەرنەچوو.

**رَسَبَ عيناه**: چاوی بەقوڵا چوو.

**أرْسَبَ فـلانٌ**: فلاَنكەس لەبرسا چاوی بەقوڵا چوو.

**أرْسَبَ فلانـاً**: فلاَنكەسی والیٚ كـرد رۆچـیٚ ٥ ببێتــە بــنكڵو بنكـرِ ٥ لەحــەدیــث دا هــاتووە دەربـارەی دۆزەخیەكان دەڵیٚ: (إذا طفـت بهـم النــار أرسـبهم الأغـلال): كـە ئـاگر حــەوایان دەدا زنجیرەكــان دایــان دەگرنەوە بۆ بنكڵی ئاگر.

**الرّاسِبُ**: بار قوڵو لەسەرە خۆ ٥ (جبـل راســـب): كێوێـــكی چەســـپاوو دامەزراو.

**الرُّســـوبُ**: ئــەو خلتــەو پلتەیــەی دەكەوێتە ژیر ئاو لەڕێرەوی جۆگـاو جۆم دا.

**الرَّسوبُ**: شمشێری بڕندە كە لەبرین دا گـوم ببیٚ ٥ پیـاوی عـاقڵو لەسـەرە خۆ.

**المراسِبُ**: كۆڵەكەو پایـە ٥ بینـای قـایمو پتەو.

**المِرْسِبُ من السيوف**: شمشێری بڕنـده ٥ (ك: مراسب).

**رَسْـت**: یەكـەم مـەقامی حـەوت مەقامـە رەسەنەكانە، لەبواری مۆسیقادا.

**الرُّسْتاقُ**: بـەمانا (الـرُّزداق) دیٚ، واتـە: چەند گوندو كۆمەڵە خانوێك.

**رَسِحَ رَسَحاً**: گۆشتی سمتی كەم بوو، ڕانـی لەڕو لاواز بـوون ٥ (هو أرْسَـحُ وهـي رَسْحَاءُ).

**الرَّسْـحَاءُ**: ئـافرەتی سمت لـەڕو لاواز ٥ (ك: رُسْحٌ).

**رَسَـخَ رُسـوخاً**: لەشـوێنی خـۆی جێـگیرو چەسپاو مایەوە.

**رَسَخَ الغديرُ**: زەلكاوەكە ئاوەكەی رۆچوو.

**رَسَـخَ المطـرُ**: ئـاوی بارانەكـە بـەزەوی دا رۆچوە خوار.

**رَسَخَ العِلمُ في قلبـه**: زانیارییەكـە لـەدڵی دا جێــگیر بــوو بــوو بەحەقیقــەتی زانستیو شكو گومانی نەما.

**أرْسَخَهُ**: چەسپاندی.

**رَسْرَسَ البعيرُ**: حوشترەكە تـوانی راسـت بێتـەوە.

**رَسَّتِ الجرادةُ رسًّا ورسيساً**: كوللەكە كلكی لـەزەوی چـەقاند بۆئـەوەی هێلكـە بكاو گەرا دابنیٚ.

**رَسَّ الشَّيْءُ فِي الشَّيْءِ:** شتەكە چووە ناو شتەكەی ترەوەو جێگیر بوو، دەگوترێ: (رسّ الغرام في قلبه): عەشق‌و دڵداری لەدڵی دا چەسپا، (رسّ السقم في جسده) نەخۆشی لەجەستەی دا جێگیر بوو.

**رَسَّ الشَّيْءَ رسًّا:** شتەكەی لەبیر چۆوە چونكە ماوەی زۆری بەسەردا تێپەڕی.

**رَسَّ البِئْرَ:** بیرەكەی هەڵكەند.

**رَسَّ خَبَرَ القومِ:** توشی خەڵكەكە بوو بەسەر كاروباریان دا ئاگادار بوو.

**رَسَّ له الخَبَرَ:** هەواڵەكەی بۆ گێڕایەوە.

**رَسَّ الميتَ:** مردووەكەی ناشت.

**رَسَّ الشَّيْءَ:** شتەكەی خستە ناو گڵەوە.

**أَرَسَّ:** چووە زورو جێگیر بوو، دەگوترێ: (أَرَسّ السقم في جسده): نەخۆشی لەجەستەی دا جێگیر بوو.

**أَرَسَّ الشَّيْءَ:** نیشانەی بۆشتەكە دانا.

**رَسَّسَ البعيرُ:** حوشترەكە توانی راست بێتەوە.

**ارْتَسَّ الخَبَرُ:** هەواڵەكە بڵاو بۆوە.

**تراسُّوا الخَبَرَ:** هەواڵەكەیان بۆ یەكتر گێڕایەوە.

**الأُرْسُوسَةُ:** هەرشتێك سەری پێ داپۆشرێ جا مێزەربێ، كڵاوبێ هەرشتێكی تر بێ.

**الرَّسُّ:** كان‌و مەعدەن ٥ بیرێك كەهەڵنەچنرابێ ٥ بیرێك بوو لەناو قەومی ثەمود ٥ سەرەتای شت ٥ پاشماوەی شت ٥ لایەنێكی شت، دەگوترێ: (به رسّ الحِمى): سەرەتای تای پێوە دیارە ٥ (رسّ الحب): پاشماوەی دڵداری ٥ (رَسٌّ من الخبر): لایەنێكی هەواڵ ٥ (ك: رِسَاسٌ).

**الرُّسَّةُ:** پۆشاكی سەر كڵاو، مێزەر، عەگاڵ.

**الرَّسِيسُ:** سەرەتای شت یان پاشماوەی شت، دەگوترێ: (به رسيس الحُمى): سەرەتای لەرزوتای لێ دیاری داوە ٥ شتی چەسپاو لەشوێنی خۆی ٥ عاقڵی زیرەك، دەگوترێ: (ريح رسيس المس): شنەبایەكی خۆشە نەرم نەرم لەجەستە دەدا گەشەی پێ دەكا.

**رَسَعَت العينُ رَسْعاً:** چاوەكانی كوێربوون، پێڵوی چاوەكانی بەیەك دا نووسان.

**رَسَعَ العضو:** ئەندامەكەی جەستەی لەكاركەوت كەڵكی نەما.

**رَسَعَ الصَّبِيُّ وَغَيْرَهُ:** مێروی شینی لەقاچی منداڵەكە كرد یان مێروی شینی بەئاژەڵەكەوە هەڵواسی بۆ چاوەزار.

رَسِعَ فلان وَرَسِعَ به الشَّيْءُ: فلانكەس پێوە نووسا ٥ شتەكەی پێوە نووسا ٥ (هو أرْسَعُ وهي رسعاءُ).
رَسَّعَتْ عينُهُ: بەمانا (رسعت) دێ، دەگوترێ: (رَسَّعَ فلان): فلانكەس لەماڵەوە دانیشت، ماڵی بەجێ نەهێشت.
الرِّسَاعَةُ: سیرمەو گوڵینكن بەدامێنی قایشی شمشێرەوە دەكرێن، قایشی لەشان كردنی شمشێر كەپێی دەگوترێ حەمایەڵ.
الرَّسِيعُ: پێكەوە نووساو ٥ لەزگێندراو.
المُرَسَّعُ: نەومیە بەهۆی شەو بەخەبەری چاوی لیڵ‌و وێڵبن.
المُرَسِّعُ: كەسێك پێڵوی چاوی پێكەوە نووسابن.
المُرَسِّعة: بەمانا (المُرَسِّعُ) دێ ٥ پیاوێك لەماڵ نەچێتە دەر.
المُرَسَّعةُ: نوشتەیەكە، هەندێ مێروو تەنتەنەن دەكرێنە دەستی منداڵەوە وەكوو بازنە بۆ چاوەزار.
رَسَغَ المطرُ رَسْغاً: ئاوی باران گەیشتە پشت قولەپێ.
رَسَّغَ البعيرَ ونحوه: پەتی بەقاچی حوشترەكەوە بەست، بەستییەوە.
راسَغَهُ مُراسَغَةً ورِساغاً: لەكاتی زۆرانبازی دا باریكایی قاچی گرت.
رَسَّغَ: ژیانی بۆ خۆش كرد، دەگوترێ: (رَسَّغ عليه في العيش).
رَسَغَ في الكلام: قسەكانی هەڵبەستن.
رَسَغَ المطرُ: بەمانا (رَسَغَ) دێ.
ارْتَسَغَ على عياله: بژێوی باش‌و چاكی بۆ خێزانەكەی دابین كرد.
الرِّساغ: حەبلێكە قاچی حوشتر یان هەر ئاژەڵێكی تری پێ دەبەسترێتەوە بەم جۆرە سەرێكی حەبلەكە لەقاچی توند دەكرێ‌و سەرەكەی تری بە سنگێكەوە دەبەسترێ.
الرُّسْغُ: بەمانا (الرّساغ)دێ ٥ جومگەی دەست نێوانی قۆڵ‌و لەپەدەست، یان نێوان بەلەك‌و پوزو قولەپێ ٥ (ك: أرساغ وأرسُغُ).
الرَّسَغُ: شلایی قاچی حوشتر ٥ نەرمایی قاچی حوشتر.
الرَّسِيغ: بەرفراوان، زۆرو زەبەندە، دەگوترێ: (عيش رسيغ): ژیانی خۆش‌و هەرزانی ٥ (طعام رسيغ): خواردنی زۆرو زەبەندە.
المُرسَّغُ: رای نابەجێ، دەگوترێ: (رأي مُرَسَّغٌ).
رَسَفَ في القيد رسفاً ورسفاناً ورسيفاً: هێواش هێواش بەپێوەندەوە رۆیی.
أرْسَفَ الإبلَ: بەپێوەندەوە حوشترەكەی راونا.
رَسِلَ البعيرُ رَسَلاً: حوشترەكە رۆیشتنی

لەسەرەخۆو نەرمو نیانە.

رَسِلَ الشَّعْرُ: مووەکان درێژو نەرمن.

أرْسَلَ الشَّيْءَ: شتەکەی بەرەڵاکرد، وازی لی هێنا، دەگوترێ: (أرسلت الطائرَ من يديَّ) باڵندەکەم بەرەڵا کرد لەدەستم ٥ (أرسل الكلامَ): قسەکەی بەشێوەی گشتی ئاراستە کردو تایبەتی نەکرد.

أرْسَلَ الرَسولَ: فرستادەی نارد بەنامەو پەیامەوە.

أرْسَلَ الكلابَ على الصيد: سەگەکانی لەنێچیرەکە بەردا.

رَاسَلَهُ في عمله: لەکارو پیشەدا چاوی لەوکرد.

رَاسَلَ الغِناءَ: لەگۆرانی دا لاسایی ئەوی کردەوە.

رَاسَلَهُ: فرستادەی بۆ نارد، نامەی بۆ نارد.

رَسَّلَ في القراءة: لەخوێندنەوەدا لەسەرەخۆو بەلێ وردبوونەوەیەکی تەواوەوە وشەو رستەکانی خوێندنەوە.

تراسَلَ القومُ: خەڵکەکە هەندێکیان فرستادە یان نامەیان بۆلای هەندێکی تریان نارد.

تَرَسَّلَ: لەسەرە خۆ بوو بەهێواشی کارەکانی ئەنجام دا.

تَرَسَّلَ الكاتب: نووسەرەکە، وتاربێژەکە قسەکانی بەشێوەی سەجعو سەرەوا نەکردن.

تَرَسَّلَ في الرّكوب: قاچی لەسەر ولاخەکە راکێشان بۆئەوەی بەپۆشاکەکەی دایانپۆشی.

تَرَسَّلَ في القعود: چوار مەشقی دانیشتو بە پۆشاکەکەی قاچی داپۆشی.

اِسْتَرْسَلَ الشَّعْرُ: زوڵفەکانی شۆڕبوونەوە.

اِسْتَرْسَلَ الشَّيْءُ: شتەکە ئاسان بوو.

اِسْتَرْسَلَ اليه: بۆلای چوو خۆی پێوەگرتو دڵی پێ کرایەوە.

اِسْتَرْسَلَ به: بتمانەی پێ بوو.

الرّاسلان: دووشان یان دوو ڕەگی شان.

الرِّسالُ: قاچی حوشتر، هەرچوار قاچی.

الرِّسالة: نامە، پەیام ٥ کتێبێک چەند مەسەلەیەکی لەخۆ گرتبێ ٥ بەحثێکی ئەکادیمی قوتابی ئامادەی دەکا بۆ وەرگرتنی شەهادەی بالا ٥ دیبلۆم عالی، ماجستیر، دکتورا...هتد.

رسالة الرسول: پەیامی پێغەمبەر، ئەوەی لەخوداوە فەرمانی پێ کراوە بەئادەمیزادی بگەیەنێ و بانگەوازی خەڵکی بکا بۆ پەیڕەویکردنی پەیامەکەی.

الرِّسْلُ: هەرشتێک نەرمو نیانی

تێدابێ، دەگوترێ: (شَعْرٌ رسل): قژی نەرم ○ (بعير رسل): حوشتری نەرم ڕۆ.

**الرِّسْلُ**: هێدیو هێمن، دەگوترێ: (افعل كذا على رِسْلِكَ): ئەوكارە بەهێدیو هێمنی ئەنجام بدە ○ هەروا بەمانا ماستو شیر دێ.

**الرَّسَلُ**: جەلەبە مەڕو بزن ○ گارانە ڕەشە ولاخ ○ گاڕانە حوشتر ○ ڕەوە ئەسپ ○ کۆمەڵێك ئادەمیزاد ○ (ك: أرسال)، دەگوترێ: (جاء القوم أرسالاً، وجاءت الإبل والخيل أرسالاً): خەڵکەکە کۆمەڵ کۆمەڵ هاتن ○ حوشترو ئەسپەکان وەجبە وەجبە هاتن.

**الرُّسُلُ**: کەنیزەکی بچوك کە چارشێو بەخۆدا نەدا.

**الرَّسْلَةُ**: مێینەی (الرَّسْل)ە ○ نەرمو نیان ○ نازو خۆشی، دەگوترێ: (هم في رَسْلَةٍ من العيش): ئەوان لەژیانێکی خۆشو پڕ نازو نیعمەت دان ○ ئافرەتێك توکی جەستەی زۆربێ.

**الرِّسْلَةُ**: هێدیو هێمنو سۆزو بەزەیی، دەگوترێ: (إفعل كذا على رِسْلَتِكَ): ئەوکارە لەسەرە خۆ ئەنجام بدە ○ (جاءوا رِسْلَة رِسْلَةً): کۆمەڵ کۆمەڵ هاتن.

**الرَّسُولُ**: پێغەمبەر، ڕەوانەکراو بەپەیامەوە ○ لەفریشتە ئەوانەن لەخوداوە پەیام دەهێنن ○ لە ئادەمیزاد کەسێکە خودا دەینێرێ بە پەیامێکەوە کاری پێ بکاو بەخەڵکیشی ڕابگەیەنێ.

**الرَّسِيلُ**: بەمانا (الرَّسُولُ) دێ ○ نامەبەر، بەرفراوان، ئاسان، شتی سوكو ئاسان، ئاوی شیرینو گوارا.

**الرُّسَيْلَةُ**: دەگوترێ: (ألقى الكلامَ على رُسَيْلَتِهِ): بەبێ لێورد بوونەوەو ڕاوەستان قسەکانی کردن.

**المُراسِلُ من النساء**: ئەو ئافرەتەیە بۆخۆی خوازبێنی کاران بانگ بکا بۆئەوەی بیخوازن ○ یان ئەو ئافرەتەیە لەمێردەکەی جیا بوبێتەوە بەهۆی تەڵاقو شتی وەهاوە، یان ئافرەتێك جەستەی توکن بێ، یان قاچی توکن بن، یان ئافرەتی تەرپیر.

**مُراسِلُ الصحيفة**: کەسێکە لەدوورەوە هەواڵ بۆ ڕۆژنامە یان گۆڤارەکە دەنێرێ ○ هەواڵنێر لەدوورەوە.

**المِرْسَالُ**: بەمانا (الرّسول)دێ ○ حوشتری سەر نەرمو خۆشڕۆو خێرا ڕۆ.

**المُرْسَلُ**: لەزاراوەی عیلمی حەدیث دا ئەوەیە لەزنجیرەی ڕاوییەکان دا

صەحابە نەبێ، وەکوو ئەوە تابیعی لە پێغەمبەرەوە حەدیث ریوایەت بکاو ناوی ئەو صەحابەیەی حەدیثەکەی لێ بیستوە نەهێنێ ٥ (نثر مرسل): پەخشانی بێ قافیەو سەرەوا پێچەوانەی پەخشانی سەجع ئامێز ٥ (شِعْرُ مُرْسَلٌ): شیعرێك کە پابەندی یەك سەرەوانەبێو سەرەواکانی جیاجیا بن.

المُرْسَلاَت: کە لە قورئان دا هاتووە بەمانا بایە، یان فریشتە یان ئەسپ.

المُرْسَلَةُ: مێینەی (المُرْسَلَ) ٥ بەرمۆر ٥ ملەوانکەیەك درێژ بێ بگاتە سەر سینگ.

رَسَمَت النَّاقةُ: حوشترەکە بەنەرمە غار رۆیشت ٥ بەقاچەکانی شوێنی لەزەوی کرد.

رَسَمَ فلان رسماً ورسماناً: فلانکەس جوان رۆیشت.

رَسَمَ نحوه: بۆلای رۆیشت بەپەلە.

رَسَمَ في الأرض: لەزەوییەکە دا گوم بوو.

رَسَمَ على الورق: لەسەر کاغەزەکە خەتی کێشا.

رَسَمَ للبناء: نیشانەی بۆ باڵەخانەکە دانا.

رَسَمَ الکتاب: کتێبەکەی نووسیەوە.

رَسَمَ الحَبَّ بالروسم: گەنمەکەی بەرەوسەم مۆر کرد.

رَسَمَ له کذا: فەرمانی بەوە پێ کرد.

رَسَمَ لە بکذا: مەرسومی بۆ نووسی (فەرمانی دامەزراندنی بۆ دەرکرد).

رَسَمَ الغیثُ الدیار: باران شوێنەواری کەلاوەکانی کوێر کردەوە.

رَسَمَ الأسقفُ فلاناً: ئەسقوف پلەو پایەیەکی کەنیسەی دایە فلان.

أرسم النَّاقةَ: حوشترەکەی تاودا بۆئەوەی خێرا بڕوا.

رَسَّمَ الثوبَ: خەتخەتی وردو شاراوەی لەکراسەکە کرد.

إرْتَسَمَ: دەگوترێ: (أنا أرْتَسِمُ مَراسِمَكَ): من لەرێو رەسمی تۆ دەرناچم.

إرْتَسَمَ فلانٌ: فلانکەس (الله أکبر)ی کرد پاڕایەوە لەخودا.

إرْتَسَمَ المسیحيّ: پیاوە ئاینیە مەسیحییەکە بەرز کرایەوە بۆ پلەی کاهین.

تَرَسَّمَ فلان: فلانکەس ڕوانی لەکوێ کانگە هەڵکەنێو بینا بکا.

تَرَسَّمَ الرَّسْمَ: بۆ رەسمەکەی ڕوانی.

تَرَسَّمَ المنزِلَ: لەخانوو مەنزڵگاکە ورد بۆوە، لێی ڕوانی.

تَرَسَّمَ القصیدَةَ: لەچامە شیعرەکە ورد بۆوە بزانی چۆنەو چۆن نییە.

تَرَسَّمَ الشَّيْءَ: بیری شتەکەی کردەوە وەلێ ئەنجامی نەدا.

**الراسِمُ:** ناوی ڕەوان ٥ (ك: رواسم).

**الراسـوم:** مۆرێـکە زارکـی هەمبانـەو تورەکەی پێ مۆر دەکرێ.

**الرّسامة:** پیشەی وێنەگری.

**الرّسّام:** وێنەکێش بەقەڵەمو شتی وا.

**الرَّسْـمُ:** شـوێنەواری خـانوو کـەلاوە ٥ لەزانیاری مەنتیق دا پێناسەی شتە بـە تایبەتمەندییـەکانی ٥ بـڕی پارەیـە حکومـەت دەیخاتـە سـەر هاووڵاتیانی لەجیاتی خزمەتگوزاری کـە پێـشکەشیانی دەکـا ٥ وەکـوو ڕەسمی بەریدو ڕەسمی تاپۆو ڕەسمی قەضاو داد.

**الرَّسَمُ:** جوان ڕۆیشتن.

**الرسمي (العمل الرسمي):** کارێـکە یـان گوفتارێـکە بـۆ دەوڵـەت دەکـرێو بـەگوێرەی قـانونو یاسـایەکی تایبەتی ئەنجام دەدرێ.

**الرَّسومُ:** ئـەوەی شـەوو ڕۆژێـك لەسـەر یەك بەردەوام دەبێ لەسەر ڕۆیشتن ٥ حوشـترەکە بـەهۆی تونـد قـاچ بـەزەوی دا دان دا شـوێنەوار لەزەوییەکە بکا.

**الرَّوسَمُ:** کارەسـات ٥ شـتی زەندەقبـەر ٥ شتێـکە دیناری زێڕی پێ تیف تیفـە دەدرێ پێـی جـەلایی دەکـرێ ٥ لەوحێـکە نووسـراوی لەسـەر نووسراوە شتی پێ مۆر دەکرێ.

**المَرْسَـمُ:** زۆری ڕەسـمو وێنەکێـشان لەقوتابخانەکانو شوێنی تردا.

**المرسـوم:** فەرمانێـکی ڕەسمییـە پاشای وڵات (سەرەك كۆمـار) بەشێوەیەکی تایبـەتی دەینووسـێو ئاڕاسـتەی شـوێنی پێویـستی دەکـا دەربـارەی کارێك لەکارەکانی وڵات، ئیتر وەکوو دەستوورو قانون کاری پێ دەکرێ ٥ (ك: مراسیم).

**رَسَنَ الدّابَّـةَ رَسْـناً:** هەوساری وڵاخەکەی تونـد کـرد ٥ دەمێنـی وڵاخەکـەی توند کـرد، دەگـوترێ: (رُمـيَ برسنه علـى غاربـه): هەوسـارەکەی خـستە سـەر ملـیو بـەرەڵڵای کـرد بۆکـوێ دەچـێ بچێو کـەس مـەنعی نـەکا ٥ (ك: أرسان، أرسُن).

**اَلْمَرْسِـنُ:** لـوت، ئەوشـوێنەی لـەوڵاخ هەوسـاری تـێ دەکـرێ، دەگـوترێ: (فَعَلْتُ ذلك رغم مرسنه): واتە (رغم أنفـه)، هـەروا دەگـوترێ: (سَـلِسَ مرسَـنُه): ئـەو وڵاخـە هەوسـاری خۆشـە سـەر ڕەق نییـە ٥ (ك: مراسن).

**رَسا الشّيْئُ رَسواً ورَسـوّاً:** شـتەکە جێـگیر بوو.

**رَسـا الجَبَـلَ:** کێوەکـە بناغـەی بـەزەوی دا ڕۆچووە.

رَسا قَدَمُهُ: لەشەڕدا خۆگرو جەربەزە بوو.
رَسَت السفينة: کەشتییەکە لەڕۆیشتن کەوت‌و لەنگەری گرت.
رَسا بين القوم رَسْواً: چاکسازی لەناو خەڵکەکە دا کرد.
رَسا لە رَسْواً من الحديث: بەشێکی لەحەدیث و روداوەکە بۆ گێڕایەوە.
رَسا عنه الحديث: فەرمایشتەکەی لەوەوە گێڕایەوە.
رَسا الحديث في نفسه: لەدڵی خۆی دا باسی ئەوەی کرد.
أرسى الشَّيْئَ: بەمانا (رَسَا)دێ، دەگوترێ: (أرستِ السفينةُ): کەشتییەکە لەنگەری گرت.
أرسى الشَّيْئَ: شتەکەی چەسپاند، دەگوترێ: (أرسَيْت السفينة): کەشتییەکەم ڕاوەستاند.
أرسى الوَتَدَ في الأرض: سینگەکەی داکوتا بەزەوی دا.
الرّاسي: چەسپاوو دامەزراو ٥ (ك: الرواسي).
الراسية: مێینەی (الراسي)یە ٥ (قِدر راسية): مەنجەڵی چەسپاو کۆڵینەی گەورەو چەسپاو کەلەبەر گەورەیی لەشوێنی خۆی نەجوڵێ.
الرَّسوُ: لایەنێکی چیرۆك‌و بەسەرهاتە.
الرُّسْوَة: بازنەی پان‌و تەخت ٥ جۆرە بازنەیەکە پارچە پارچە لێك دەبەسترێ‌و نەخشی تێدایە ٥ دەستەوانەی میرو ٥ (ك: رَسَوات).
الرَّسِيُّ: کۆڵەکەی چەقیوو چەسپاو لەناو قەدی ڕەشماڵدا ٥ کەسێك بەردەوام بێ لەسەرکاری خۆی چ خێر چ شەڕ.
الْمُرسى: شوێنی لەنگەر گرتنی کەشتی لەبەندەردا یان لەقەراخ دەریادا ٥ (ك: مراسٍ).
مَرْسَ المزاد: لەقانون دا ئەنجامدانی فرۆشتنی کالایە بەو کەسەی لەمەزاددا کڕینەکەی بۆ دەردەچێ.
المِرْسَاةُ: شتێکی قورسە دەخرێتە ناو ئاوەکە بۆ ئەوەی کەشتییەکە رابگرێ‌و لەنگەری پێ بگرێ، دەگوترێ: (ألقى القوم مراسِيَهُمْ): خەڵکەکە جێگیر بوون چیدی بەکۆچەری نەمانەوە وازیان لەگەڕیدەیی هێنا ٥ (ألقى السحابُ مَراسِيَه): هەورەکە لەئاستێك دا وەستاو بارانەکەی باراند.
رَشَأت الظبيةُ رشئاً: ئاسکەکە زاو بێچوی بوو.
الرَّشَأ: بێچوی ئاسك کاتێك هێز پەیدا دەکاو دەتوانێ لەگەڵ دایکەکەی بڕوا ٥ درەختێکە بەرز دەبێتەوە

بەئەنـــدازەی بـــاڵا پیاوێـــك گەڵاكـــەی وەكوو گەڵا هەنجیر وایە ٥ بـەروبوومی نییەو ناشخورێ.

الرَّشـــتَةُ: هەویرێـــكە بـــەتازەیی نـــانی تـــەنكی لـــێ دەكـــرێو دوایـــی نانەكـــە دەشـــكێندرێتەوەو لەگـــەڵ شـــیردا دەكوڵێنـدرێ.

رَشَحَ العرق رشـحاً ورشـحاناً: عەرەقەكە هاتەدەرو ڕەوان بوو.

رَشَحَ الجَسَدُ: لاشەكە عەرەقی كرد.

رَشَحَت القربة بالماء: گۆزەكە ئـاوی لـێ تكاو دڵۆپ دڵۆپ ئاوی لـێ هاتەدەر.

رَشَـحَ الظبـــيُ ونحـــوه رشـحاً ورشـــوحاً: ئاســـكەكە یەكـــەم جـــار لەگـــەڵ دایكەكـەی دەسـتی بەرۆیـشتن یـان توانـای ڕۆیـشتنی پەیـداكرد، یـان بازی دا.

أرْشَحَ: بەمانا (رَشَحَ)دێ.

رَشَـــحَت الأُم: دایكەكـــە بێـــچووەكەی لەگەڵی دا كەوتەڕێ.

رَشَّحَهُ: بەخێوی كردو گەشەی پێ كرد.

رَشَحَ للشَّيءِ: ئامـادەی كـرد بـۆ ئـەو شـتە، دەگـوترێ: (رَشَّـحَ فلانـاً للوظيفـة): فلانكەســـی بۆكـــارو وەظـــیفـــە پـــەروەردەكرد، یـــان بـــۆ فـــلان ئەنجومەن دیاری كـرد، یـان پاكانـەو پشتگیری بۆكرد.

رَشَّحَت الأمُ وَلَدَها: دایكەكە منداڵەكـەی فێری ڕۆیـشتن كـرد ٥ دایكەكـە كـەم كەم شیری خستە نـاو دەمـی منداڵە شـیرە خۆرەكەیـەوە بۆئـەوەی خـۆ بگرێ.

رَشَّـحَت الدَّابـة ولـدها: حەیوانەكـە بێـــــچووەكەی لـــــــستەوە دوای لەدایكبوونی.

رَشَّحَ الماشيةَ: ئاژەڵەكانی بەخێو كردنو جوان پەروەردەی كردن.

رَشَّـــحَ الـــسَّائِلَ: شـــلەمەنییەكەی بەهێڵەكو شیر پاڵێوك پاڵاوت.

تَرَشَّـحَ العَـرَقُ: بـەمانا (رَشَـحَ)دێ ٥ بێـچووی ئاسـك كـە بتوانـێ لەگـەڵ دایكی دا بڕوا.

رَشَّحَ فـلان لكـذا: فلان پێـگەیی‌و وای لـێ هات بۆ ئەوكارە بگونجێ.

استرشَحَ النبتُ: ڕوەكەكە بـەرز بـۆوەو گەشەی كرد.

استرشَـحَ الـصغيرَ: منداڵەكـەی بـەخێو كرد بۆئەوەی گەورە ببێ.

استرشَحَ النَّبـاتَ أو النبـتَ: چاوەڕوانی ڕوەكەكەی كرد درێژببێ‌و بـەخێوی بكا.

التَرشيحُ: لەزاراوەی بەلاغیان دا ئەوەیە لەئیـستیعارەدا باسـی شتێـك بكـرێ پەیوەندی‌و تایبەتمەندی بە (مـشبە بـــە)یـەوە هـەبێ ٥ پـاڵاوتنی ئـاوو جیاكردنـــەوەی قـــەبارە ڕەقـــەكان

لەناو شلەمەنی دا لەرێگەی بەکارهێنانی ئامێرێکی کونکون کە شلەمەنیەکە لەکونە بچوکەکانیەوە دەربچێو شتە رەقەکان بمێننەوە.

**الإرتشاح: (الإرتشاح النشواني):** لەپزیشکی هەناوی دا بریتییە لەروسوبو مانەوەی هەندێ ماددەی مەیلەو سوتاوو لەکارکەوتوو لەناو ئەنسیجە نەخۆشەکان دا.

**الرَّاشِحُ:** هەرشتێك بپاڵێودرێ، هەڵاوێردرێ، بتکێ ٥ هەرشتێك بەسەر زەوی دا بڕوا لەزیندەوەر بەخشۆكو پێرۆیەوە ٥ بەلای کیمیا گەرانەوە ئەو شلەمەنییە بێ خەوشەیە کەلەئاکامی پاڵاوتنەوە پەیدا دەبێ.

**الرَّشْحُ:** هەر عەرەقو ئاوێك تکە بکاو داچۆڕێ ٥ لەحەدیثێکدا کەلەبارەی قیامەتەوە دەدوێ دەفەرموێ: (حتی یبلغ الرَّشْحُ آذانهم): گەرماکە هێند توند دەبێو خەڵك عەرەقی لێ دەچۆڕێ تا دەگاتە بناگوێیان.

**الرُّشُوحُ:** (بئرٌ رَشُوحٌ): بیرەگە ئاو دەدزێ، ئاوی تێ دەزێ.

**الرَّشِيحُ:** بەمانا (الرَّشحُ)دێ ٥ یان بەمانا عەرەقە ٥ روەکی سەر زەوی بەگشتی.

**المِرْشَحُ:** ئەو پارچە قوماشەیە کەلەژێر زینو کورتانەوە لەپشتی وڵاخ دەکرێ، لەم روەوە عەرەقەکە هەڵدەمژێو وشکی دەکاتەوە ٥ فانیلەو ژێرکراس کە ئادەمیزاد لەژێر پۆشاکەوە لەبەریان دەکا بۆ وشك کردنەوەو هەڵمژینی عەرەق.

**المِرْشَحَةُ:** بەمانا (المِرْشَحُ)دێ ٥ (ك: مَرَاشِحَ).

**المُرَشِّحُ:** ئامێری پاڵاوتنو پاڵفتە کردن.

**رَشَدَ رُشداً:** شارەزا بوو.

**رشِدَ رَشَداً ورَشَاداً:** بەمانا (رَشَدَ)دێ.

**أرْشَدَهُ:** شارەزای کرد، هیدایەتی دا.

**رَشَّدَهُ:** بەمانا (أرشَدَهُ)دێ.

**رَشَّدَ القاضي الصَّبِيَّ:** قازی (دادوەر) بڕیاری دا کە منداڵەکە بۆتە پیاوو لەتەمەنی منداڵی تێپەڕی.

**إسْتَرشَدَ لە:** بۆی شارەزا کرد.

**إسْتَرشَدَ فلاناً:** داوای لەفلانکەس کرد کە شارەزای بکا.

**التَرشيد:** بڕیاردانی حاکم بەوە کە ئەو لاوە گەییشتۆتە تەمەنی کامڵیو تێگەیشتن.

**الرَّاشِد:** کەسێك بەرێكو پێکی رێبازی حەق بگرێو بەمو لێی لانەدا ٥ بۆیە ئاوەڵناوی جێنیشینەکانی پێغەمبەر (د.خ) ئەو ناوەیەو پێیان دەگوترێ (الخلفاء الراشدون).

الرَّشــادُ: روەكێـــكە ســالانە دەڕوێ دەنكێــكى هەيــە پــێى دەگــوترێ (حب الرّشاد).

الرّشادة: بەردێك پڕ بەدەست بێ.

الرُشـدُ: بـەلاى شـەرعزانانەوە ئەوەيـە منداڵ بـاڵغ ببــێ كاروبـارى ئـايينى‌و ماڵـدارى خــۆى بــەجوانى بــەڕێوە بــەرێ ٥ لــەقانون دا تەمەنێــكە هـەركاتێ ئـادەميزاد گەييشتە ئـەو ئەندازە دەتوانێ تەصەروف بەماڵى خۆيەوە بكا.

الرِّشْدَةُ: دەگـوترێ: (هو ولـد الرِّشْـدَة): منداڵێــكە بنەچــە ديـارو وەجــاخ زادەيە.

الرَّشـيد: ناوێــكە لــەناوە جوانــەكانى خــودا ٥ كەسێــكە عــاقڵ‌و ژيــر بــێ، مەزنـدە كردنـى ڕێـك‌و پێـك بــێ ٥ بـــەمانا ئامۆژگـــارى كـــەرو رێ نيـشاندەريش دێ ٥ كەسێــكە بگاتــە تەمــەنى بــاڵقى‌و بــەپياو حــسێب بكــرێ ٥ بــۆ مێينـــە دەگــوترێ: (رشيدة).

المراشِدُ: مەبەستەكان.

المُرْشِـدُ: واعيــزو ئامۆژگاريكــەر ٥ رێ نيـــشاندەرى كەشـــتى‌و بەلـــەم لەتــەنگاوو تەنگــە بــەرەكان دا ٥ رێبەرى پۆليس.

رَشْـرَشَ: خــۆى شـلْ كــرد ٥ (رَشْــرَشَ الــبعير): حوشــترەكە يخــى خــواردو بەسنگى زەوييەكەى تەخت كرد بۆ ئەوەى پشوو بدا.

تَرَشْـرَشَ: رەوان بــوو، تكـەى كــرد، بڵاو بۆوە، بەحەوادا چوو.

تَرَشْــرَشَ الــشّواءُ: گۆشــتە برژاوەكــە چەوربيەكەى تكايە خوار.

الرَّشْراشُ: نەرم، شل، دەگوترێ: (خبـز رَشْـراش): نانێـكى وشك‌و نەرمـە ٥ (عظم رشراش): ئێـسقێكى نەرمـە ٥ (شواء رشـراش): گۆشـتە برژاوێـكە چەوربيەكەى تكاوە.

الرَّشْرَشُ من الخبـز: بـەمانا (الرشـراش) دێ ٥

رَشَّت السماءُ رشّاً: ئاسمان بارانى باراند، يــان نەرمــە بــارانى بارانــد ٥ بــارانى رشـاند، دەگـوترێ: (رشــت العــينُ): چـاو فرمێـسكى هەڵڕشــتن ٥ (أرض مرشوشـــــة): زەوييـــەكى بـــەئاو ڕشێنراوە.

رَشَّ البَيْتَ والثوبَ: ئاو ماڵەكەى ئاوڕشێن كرد يان ئاوى لە پۆشاكەكە پرژانـد، دەشگوترێ: (رشّ عليه الماء):

رَشَّ الطريــقَ: ئــاوى لــە رێــگاكە پرژانــد بۆئەوەى تۆزەكەى بمرێ.

أرشّــتِ الــسماءُ: بــەمانا (رشـــت)دێ.

**أرشتِ الطّعْنَةُ ونحوها**: برینەکە خوێنی لێ ڕەوان بوو پرژا.

**أرشى الفَرَسَ ونحوه**: بەغار پێکردن ئەسپەکەی عەرەقاوی کرد.

**أرشى الفصيلَ**: کلکی بێچووەکەی خوراند بۆئەوەی شیربخوا.

**تَرَشَّشَ السائلُ**: شلەمەنییەکە پرژاو بەهەوادا چوو.

**استرشَ الفصيلُ للرضاع**: بێچووەکە ملی درێژ کرد بۆناو دوو ڕانی دایکی بۆ ئەوەی شیربخوا، گوانەکانی بمژێ.

**الرَّشَّاشُ**: ئاو پرژێنکەر، ئامێرێکە شلەمەنی پێ دەپرژێندرێ ٥ تاکەکەی (رشاشة).

**الرَّشُّ**: بەمانا (الرَّشَّاش) دێ ٥ نەرمە باران ٥ (ك: رِشَاشٌ).

**الرَّشَّاشُ**: جۆرە چەکێکە بەرپێز گوللە دەتەقێنێ.

**المَرِشُّ**: دەگوترێ: (شواء مُرِشٌ) گۆشتە برژاوێکە تك تك چەورییەکەی لێ دێتە خوار.

**المِرَشَّةُ**: ئامێرێکە ئاوی پێ دەپرژێندرێ ٥ (ك: مَراش).

**رَشَفَ الماءَ ونَحوَهُ رشفاً ورشيفاً**: بەلێوی ئاوەکەی هەڵمژی.

**رَشَفَ الإناءَ**: ئەوەی لەقاپەکە دا بوو هەڵی مژیو لستییەوە.

**رَشِفَهُ رَشَفاً ورشفاناً**: بەمانا (رَشَفَهُ) دێ.

**أرشَفَ الماءَ**: بەمانا (رَشَفَهُ)دێ.

**إرْتَشَفَهُ**: هەڵی مژی.

**تَرَشَّفَهُ**: قوم قوم هەڵی مژی.

**الرَّشْفُ**: پاشماوەی شلەمەنی کەلەبنکی قاپو گلاس دا دەمێنێتەوە بەلێو دەلسترێتەوە ٥ دەگوترێ: (حَوْضٌ رَشْفٌ): حەوزێکە ئاوی تێدا نەماوە.

**الرَّشَفُ**: بەمانا (الرَّشْفُ)دێ.

**الرَّشُوفُ**: دەگوترێ: (إمرأة رَشُوفٌ): ئافرەتێکی دەم پاكو دەمو قسە خۆشو بۆنخۆشە ٥ هەروا دەگوترێ: (ريق رشوف).

**الرَّشيفُ**: دەگوترێ: (حوض رشيف) حەوزێکە ئاوی تێدا نییە.

**المَرْشَفُ**: شوێنی ئەو جۆرە شلەمەنییە کەلەبنکی قاپ دا دەمێنێتەوە ٥ (ك: مَراشِفُ).

**رَشَقَهُ رَشْقاً**: ڕەمی کرد، تفەنگی پێوەنا، تیری تێگرت.

**رَشَقَ ببصره**: چاوی تێ بڕی ٥ (رشقه بلسانه): قسەی پێ گوتن، گلەیی لێکردو بەسەر کۆنەکردن دایگرت.

**رَشُقَ رَشَاقَةً**: قەدی باریكو بالای جوان بوو.

**رَشَقَ في عَمَلِهِ**: بەئاسانیو بەخێرایی

کارەکانی ئەنجام دەدا، دەگوترێ: (رجل رشيق) و(خط رشيق) و(فتاة رشيقة) و(قوس رشيقة).

أَرْشَقَ: بۆی ڕوانیو سەیری کرد.

أَرْشَقَ الرامي: هاوێژەرەکە یەکجار رەمی کرد.

أَرْشَقَت الظَبْيَةُ: ئاسکەکە ملی درێژ کرد.

أَرْشَقَ اليه النظرَ: چاوی تێ بڕیو زۆری سەیر کرد.

راشَقَهُ: لەگەڵیا ڕۆیشتو هاوڕا بوو، دەگوترێ: (راشَقَني لقصدي): پێشبڕکێی لەگەڵ دا کردم بۆ ئەنجامدانی مەبەست.

تراشَقَ القومُ: خەڵکەکە یەکتریان تیرباران کرد، بەرد باران کرد، دەگوترێ: (تراشقوا بألسنتهم): قسەیان بەیەکتر گوتن.

تَرَشَّقَ في الأمر: لەکارەکەدا توندو تیژی کرد.

الأَرْشَقُ: دەگوترێ: (جيد أرشق) گەردنی بڵند.

الرِّشْقُ: کەوانێك کە خێرا خێرا تیری پێ بهاوێژرێ.

الرَّشْقُ: یەکجار رەمی کردنو ئەو شتەی دەهاوێژرێ ٥ سیرەو جیرەی قەڵەم لەکاتی نووسین دا ٥ (ك: أرشاق).

رَشَمَهُ رَشْماً: وێنەی گرتو نووسی، دەگوترێ: (رشم اليه): بۆی نووسی.

رَشَمَ الحُبوبَ بالرَّوْشَم: فەردە دانەوێڵەکانی مۆرکردن بەمۆری تایبەتی.

رَشِمَ رَشَماً: فلان خاڵو کوتراوو خێتو چرچی پێوە بوون ٥ (فهو أرشم وهي رشماءُ) ٥ (ك: رُشْمٌ).

أَرْشَمَ الشَجَرُ: درەختەکە گەڵای کرد.

أرشمت الأرضُ: ڕوەكو گژوگیای زەوی سەری دەرهێنا.

أَرشَمَ البرقُ: بەهێواشی هەورەکە بروسکەی دا.

ارتشم: دەمی زەرفەکەیان تورەکەکە یان قوتووەکەی مۆرکرد بەمۆری ڕەوشەم.

الأَرْشَمُ: شتێك یەك ڕەنگ نەبێ ڕەنگی تری تێکەڵاو بن ٥ سەگو پشیلەو ئەو جۆرە حەیوانانە سەرلبۆزیان رەش بێ ٥ بارانی کەمو زیانبەخش، بارانی کەمو ناوەخت، دەگوترێ: (غيث أرشم وعام أرشم): بارانی بێ خێرو بەرەکەت، ساڵی قڕو نەهات ٥ ئادەمیزادی ئەوسن.

الرَّاشومُ: مۆر، قالبی نووسراو کەلە کوێنیو فەردەو شتی وا دەدرێ.

المِرْشَمُ: بەمانا (الأرشم) دێ.

**رَشَنَ** رَشناً ورُشوناً: چووە ناو هەموو کارێکی ناشیرینەوە ◦ هەڵس‌و کەوتی نەفامانەو منداڵانەی کرد.

**رَشَنَ الكلبُ في الإناء**: سەگەکە دەمی خستە ناو قاپە خواردەمەنیەکە.

**الرّاشِنُ**: ئەوکەسەی بۆنی خواردن بکاو لەکاتی خۆی دا خۆی بۆ دا هەنگێوێ ◦ ئەوشتەی دەدرێ بە شاگردی وەستا.

**الرُّشنُ**: قوناوی روبار کە ناوی لێ هەڵدەگوێزرێ.

**الرَّوْشَنُ**: رەفەی شت لەسەردانان ◦ کولانەی هەواو روناکی ◦ پەنجەرەی سەرجادەو کۆڵان ◦ (ك: رواشن).

**رَشَا الفرخُ** رشواً: بێچوەکە ملی درێژکرد بۆلای دایکی بۆئەوەی خواردنی بخاتە دەمەوە.

**رَشَا فلاناً**: بەرتیلی دا بەفلانکەس.

**أرْشَى الشجرُ والحنظلُ**: لقی درەختەکە یان تولی کاڵەکە مارانەکە درێژ بوو وەکوو حەبل.

**رَشَا القومُ في دم فلان**: خەڵکەکە هەموویان هاوکارییان کرد بۆ خوێنی فلان.

**رَشَا القوم بسلاحهم فيه**: خەڵکەکە هەموو تێکرا روی چەکەکانیان کردە فلان.

**رَشَا الدَّلْوَ ونحوها**: حەبلی بۆ دۆڵچەکە دانا.

**رَشَا الفصيلَ**: شیری دا بە بێچوەکە، مێژاندی.

**راشاه**: لێی پاڕایەوە، ماستاوی بۆکردن ◦ بەرواڵەت دڵسۆزی بۆ نیشان دا.

**إرتشى**: بەرتیلی وەرگرت، دەگوترێ: (ارتشى منه رشوة).

**استرشى في حكمه**: دادوەرەکە لەپای دەرکردنی بڕیار داوای بەرتیلی کرد.

**استرشى الفصيلُ**: بێچوەکە داوای شیری کرد.

**استرشى ما في الضرع**: چی لە گوانەکەدا بوو دەری هێنا.

**ترشّاه**: نەرمو نیانی لەگەڵ دا بەکارهێنا، ویستی بەبەرتیل نەرمی بکا.

**الرِّشاءُ**: حەبل یان حەبلی دۆڵچە ◦ تولەی روەکی کولەکەو کاڵەکەمارانەو شتی وا ◦ ئەستێرەیەکە لەبورجی حوت دا کەدوا مەنزڵی مانگە، پێی دەگوترێ (بطن الحوت).

**الرُّشاة**: گیایەکە دەکوڵێندرێو دەخورێتەوە بۆ ڕەوانبونی گەدە ◦ (ك: رَشاً).

**الرِّشوَةُ**: ئەو ماڵەیە بەبەرتیل دەدرێ

بۆ وەدەستهێنانی بەرژەوەندییەکان، یان دەدرێ بۆ بەحەقدانانی بەتاڵ یان بەتاڵکردنی حەق.

**الرَّصَبُ**: لەپشتە دەست دا نێوان بنکی قامکی ناوەڕاستو پەنای.

**رَصَدَهُ رَصْداً ورَصَداً**: لەسەر ڕێگا بۆی دانیشتو چاوی بۆگێڕاو سەرنجی دایە هەڵسو کەوتی، چاودێری کرد بزانێ چی دەکاو چۆن دەکا.

**رُصِدَت الأرضُ رَصْداً**: ڕێژنە باران دای لەزەوی.

**أرصَدَت الأرضُ**: زەوییەکە کەمێ بارانی لێ باری، یان کەمێ لەوەڕی لێ ڕواو چاوەڕوان دەکرێ گیاوگژی باشی لێ بڕوێ.

**أرصَدَ الشَّيْءَ لَه**: شتەکەی بۆ ئامادەکرد، دەگوترێ: (أرصدت الجيش للقتال والفرس للطّراد): سوپام ئامادە کردووە بۆ جەنگ، ئەسپم ئامادەکرد بۆ ڕاوەدونانو هێرش بردن، هەروا دەگوترێ: (أرصد له بالخير والشر): پاداشی دایەوە بەچاك یان بەخراپ.

**أرصَدَ الحسابَ**: حیسابەکەی ئامادەکردو ئاشکرای کرد.

**راصَدَهُ**: چاودێری کرد بزانێ چی دەکا.

**اِرْتصده**: چاودێری کرد.

**تراصَدَا**: هەردوکیان چاودێری یەکتریان کرد.

**ترصَّدَهُ ولَه**: چاودێری کرد.

**الرّاصِدُ**: ڕەقیبو چاودێر ٥ ئەوکەسەی چاودێری ئەستێرە دەکاو بەدووربینی زۆر پێشکەوتوو دەڕوانێتە جەمو جوڵی ئەستێرەکان ٥ شێر ٥ (ك: رَصَدٌ، رُصادٌ) ٥ هەروا دەگوترێ: (حية راصدة).

**الرَّصْدُ**: بارانی دواباران.

**الرَّصَدُ**: ڕێگا ٥ لەوەڕی کەمو بارانی کەم ٥ یان بارانێك دوای بارانی تر ببارێ ٥ لەزاراوەو یاسای ئاسمان شوناسی دا ناوە بۆئەو شوێنە تایبەتیو ئامێرەی لێیانەوە چاودێری جەمو جوڵی ئەستێرەکان دەکرێ ٥ (ك: أرصاد).

**الرَّصدةُ**: ئەو ئەڵقە زێڕە یان زیوەیە دەکرێتە قایشی شمشێرەوە یان بڵێ ئاغزوونەی قایشەکەیەتی ٥ (ك: رُصَدٌ).

**الرَّصَدِيُّ**: ئەو کەسەی لەسەر ڕێگادا دادەنیشێ چاوەڕێی خەڵك دەکا بێنو گێچەڵیان پێ بکا شتێکیان لێ بستێنێ بەناحەق.

**الرَّصِيدُ**: بەمانا (الرّاصِدُ) دێ، دەگوترێ: (سَبُعٌ رصيدٌ): دڕندەیەکە

خۆی ماتداوە بۆئەوەی نێچیرێکی لێ هەڵبکەوێو پەلاماری بدا، (وحَيَّة رصيد): مارێکە خۆی ماتداوە شتێکی لێ هەڵبکەوێو پەلاماری بدا ◦ هەروا ناوە بۆئەو پارەیەی لەحیسابی جاری دا لەبانق دەمێنێتەوەو خاوەنەکەی رای نەکێشاوە ◦ هەروا ناوە بۆئەو ئاڵتونو زیوەی لەبانق دادەنرێ بۆئەوەی ببێتە بارمتەو بتمانە بۆ بانقە نەوت (دینارو تمەنو لیرەی کاغەزو مسو شتی وا).

**المِرْصَادَ**: رێگای چاودێریو تیشك خستنە سەر شت ◦ یان شوێنی ئەنجامدانی ئەوکارە، دەگوترێ: (هو لك بالمرصاد): ئەو بۆت لەسەنگەردایەو هەمیشە چاودێریت دەکاو ئاگای لەهەڵسو کەوتتە ◦ قورئان دەفەرموێ: ﴿إِنَّ رَبَّكَ لَبِالْمِرْصَادِ﴾ ◦ (ك: مراصيد).

**المَرْصَدُ**: رێگای چاودێری کردنو سەرنجدان ◦ یان شوێنی ئەنجامدانی ئەوکارە ◦ ناوە بۆ شوێنو فەرمانگەو ئەو ئامێرانەی کاری پێ دەکرێ ◦ هەروەها ئەو ئامێرو شوێنەی رێژەی هێزی بومەلەرزە تۆمار دەکا کەپێی دەگوترێ: (رێکختەر).

**رَصْرَصَ في المكان**: لەشوێنەکە جێگیر بوو.

**رَصْرَصَ الشَّيْءَ**: شتەکانی خستنە پەنایەکترو ریزی کردنو لێکی ترنجاندن.

**الرُّصْرَاصَةُ**: زەوی رەقو پتەو ◦ بەردێك بەملاو ئەولای رێڕەوی کارێزدا دادەنرێ بۆ بیراستنی ئاوەکە.

**رَصَّهُ رَصّاً**: هەندێ لەشتەکەی خستە پاڵ ئەوی ترو ریزی کردن ◦ بە قورقوشم پتەوی کرد یان قورقوشمی تێهەڵسوو پێی روکەش کرد.

**رَصَّ رَصَصاً**: هەندێ لەشتەکان کەوتنە پاڵ یەكو ریز بوون، دەگوترێ: (رَصَّت الأنسان): ددانەکان رێك بوون ◦ (فهو أرصُّ وهي رصّاءُ) ◦ (ك: رَصٌّ).

**رصَّصَ**: زۆر ئیلحاحی کرد لەسواڵو داواکردن دا.

**رصَّصَت المرأةُ**: ئافرەتەکە روبەندی پۆشی تەنها چاوی دیار بوون.

**رصَّصَ النقابَ**: روبەندەکەی دادایەوە تەنها چاوی دەبینران.

**رصَّصَ الشَّيْءَ**: شتەکەی لەقورقوشم دروست کرد یان بەقورقوشم روکەشی کرد.

**ارتَصَّتِ الأشياءُ**: شتەکان هەندێکیان

کەوتنە پاڵ یەکترو ڕیز بوون.

تراصّت الأشياءُ: بەمانا (إرتصت) دێ، دەگوترێ: (تراصَّ القومُ): خەڵکە لەناو خۆیان ڕێك کەوتنو یەکڕیزو یەکهەڵوێست بوون، لەجەنگ دا بەرامبەر دوژمن تێکڕا سەنگەریان گرتو ڕیزبەندی خۆیان نواند ٥ یان لەنوێژدا ڕیزبوونو شانیان بەشانی یەکترەوە نووساند.

ترصصت الأشياء: بەمانا (إرتصت) دێ ٥ (ك: أراصيص).

الأُرصُوصَةُ: جۆرە کڵاوێکە دەکرێتە سەر، یان هەرشتێك سەرداپۆشێ ٥ (ك: أراصيص).

الرَّصَاصُ: عونصورێکی فیلزە، نەرمە کێشی ذەڕییەکەی (٢٠٧/٢١)، ژمارە ذەڕییەکەی (٨٢)، توندیو خەستی (١١/٣٤)، لەپلەی گەرمی (٣٢٧)دا دەتوێتەوە، گوللەی فیشەك کە بەتفەنگو دەمانچەو کلاشینکۆفو ئەوجۆرە چەکانە دەهاوێژرێ ٥ (قلم رصاص): جۆرە پێنوسێکە.

الرَّصاصي: هەرشتێك ڕەنگی ڕەصاصی هەبێ ٥ (اَلْمَغَصُ الرصاصي): سك ئێشەیەکی توندە لەگەڵ حاڵەتی قەبز بوون دا دەبێ، کە هۆکارەکەی ژەهراوی بوونی رەصاصە ٥

الرَّصَاصَةُ: بەرد بەگشتی، یان بەردێك کە بۆ بیرازتنی کارێز لەمبەرو لەوبەری ڕێڕەوی ئاوەکەدا ڕیز دەکرێ ٥ هەروەها ئاوە بۆ بەخیلو چروك.

الرُّصِيصُ: روبەندی ئافرەت کە زۆر لەچاوی نزیك ببێتەوە.

رَصَعَ بالمكان رَصْعاً: جێگیر بوو لەوشوێنەو مایەوە.

رَصَعَ الرجلَ ونحوَهُ: بەمستە کۆڵەو شەپلاغە لەپیاوەکەی دا ٥ بەتیغ زەبری کوشندەی لێ دا.

رَصَعَ الحبُّ: دانەوێڵەکەی لەنێوان دوو بەردا هاڕی ٥ بەدەستاڕ وردی کرد ٥

رَصِعَ فلان رَصْعاً ورُصُوعاً: فلانکەس سمتی پوچو ڕانی لاواز بوون ٥ (فهو أرْصَعُ وهي رَصْعاءُ).

رَصَعَ الشّيْءَ بفمه: شتەکەی بەدەمیەوە نووساند.

رَصَعَ بالطيب: بۆنی لەخۆی دا.

أرْصَعَهُ بالرمح: بەمانا (رَصَعَهُ)دێ.

رَصَّعَهُ: بەگۆزو گوڵینکە رازاندیەوە، دەگوترێ: (رَصَّعَ التاجَ أو السيفَ بالجواهر): تاجەکەی یان شمشێرەکەی بەجەواهێرات رازاندەوە.

رَصَّعَ الطائرُ عُشَّهُ: باڵندەکە هێلانەکەی

خۆی بە پەرو پۆڵو چیلکەو شتی وا رابەست.
رَصَّعَ السير: گرێیەکی سێ سوچی لەسیرمەکە دا.
إرتَصَعَ: پێوە نووسا.
إرتَصَعَ الأسنان وغيرها: ددانەکان لێك نزیك بوون پێکەوە لکان.
إرتَصَعَ الحَبُّ: دانەوێڵەکەی هاڕی.
الترصيع: جۆرێکە لەجۆرەکانی زانیاری بەدیع، بەو شێوە وشەکان کێشەکەیان لێك بچێو کۆتاییەکەیان چون یەك بێ وەکوو قورئان دەفەرموێ: ﴿إِنَّ إِلَيْنَا إِيَابَهُمْ، ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا حِسَابَهُمْ﴾.
الرَّصِيعُ: زنجیرۆکەی قوڵفەی کیفی موصحەف.
الرَّصِيعةُ: هەر خشڵێك رازاندنەوەی پێ بکرێ یان هەر خشڵێك بازانەیی بێو دەوران دەوری تاجو شتی وای پێ برازێنرێتەوە ○ گرێی هەوسارو لغاوو شتی وا ○ گەنمە کوتاو، هەریسە ○ گۆزو گۆڵێنکەی ئەملاو ئەولای زینی ئەسپ.
المِرْصَاعُ: پارچە دارێکە یاری پێ دەکرێ وەکوو مزراح.
المِرْصَعَان: قوتکەیەکی گەورەیە لەبەرد هەڵکەندرێ وەکوو سندۆڵ ○ دەسکە سندۆڵ ئەستوراییی پڕ بە دەستی ئادەمیزادە دانەوێڵەو شتی وای پێ دەکوترێ.
رَصَفَ به الأمرُ رَصْفاً: لایەقو هاوشانیەتی، دەگوترێ: (هذا الأمر لايرصف بك): ئەو ئیشە بۆ تۆ ناشێ.
رَصَفَ الشّيْءَ: ریزی کرد، چینی رابەست، دەگوترێ: (رصف الحجارة في البناء): بەردەکانی لەچینی دیوارەکەدا ریز کرد ○ (رَصَفَ قدميه): قاچی جوت کردن ○ (رَصَفَ مابين قدميه): قاچی لێك نزیك کردنەوە.
رَصَفَ السَّهْمَ: تیلمە سیرمەکەی لەتیرەکە شەتەك دا.
رَصِف رَصَفاً: شتەکان هەندێکیان کەوتنە پاڵ هەندێکیان، دەگوترێ: (رَصِفت الأسنانُ): ددانەکان لەپوکەکان دا چاك هاتنە دەرەوەو ریز بوونو رێك وەستان.
رَصُفَ رَصَافَةً: پتەوو قایم بوو، دەگوترێ: (رَصُفَ الجَوابُ): وەڵامەکەی زۆر رێكو پێكو بەهێز بوو کەس نەیتوانی بڵێ وانییە.
أرصَفَ فلان: فلانکەس شەرابەکەی تێکەڵ کرد بەئاوی رونی هەڵڕژاو لەبەرزاییو شاخو کەنەك.
رَصَفَةُ: بەمانا (رصَفَةُ)ی.

بوصلة
مضغط او ميزان الجو
مرقب
مضغط
مضغط
نظّارة فلكيّة
ساعة شمسيّة
راديو تلسكوب
مضغط
قبّة المرصد
مقياس المطر
مقياس المطر

**اِرْتَصَفَ**: بەمانا (رَصِفَ)دێ، دەگوترێ: (هـو مُرتَـصِف الأسـنان): ددانـەکانی لێك نزیكو جوتن.

**تراصَفَ**: بەمانا (رَصِفَ) دێ، دەگوترێ: (تراصـــفوا في الـــصف): لەصـــەفا بەرێكو پێكی راوەستان.

**تَرَصَّفَ**: بەمانا (رَصِفَ) دێ.

**الرِّصاف**: بەردی ریزکراو.

**الرُّصـــافَةُ**: تیلمـە سـیرمەیەکە دواوەی شوێنی تیرخورەکەی پێ دەبەسترێ ٥ هەرشوێنێـــك لەرشـــە خـــاکی عێراق درەختـی لـێ ڕوا بـێ، دوایـی کراوە بەناو بۆ گەرەکێـك لەبەغـدا لەبـــەری خۆرهـــەلاتی روبـــاری دیجلەیە.

**الرَّصَـــفُ**: بـــەمانا (الرِّصـــاف)دێ ٥ بەربەستی ئاو ٥ ڕێڕەوی صـەهریج ٥ (ماءُ الرَّصَف): ئەو ئاوەیە لەشاخو بـەرزایی هەڵدەڕژێتـە خـوارو زۆر رونو صافە.

**الرَّصَـفَةُ**: تـاکی (الرِّصـاف) یـان بـەمانا (الرَّصَـف) دێ ٥ ڕەگێـکە لەکەشـکە ئـەژنۆدا، یـان هـەر خـودی کەشـکە ئەژنۆکەیە.

**الرَّصـیف**: بـەمانا رەصـینو پتـەو دێ، دەگوترێ: (عمل رصـیف) و(جـواب رصـیف) پتـەو رێـكو پێـکەو ڕەت ناکرێتەوە ٥ (هو رصیف فلان): ئـەو هاوشـانو وێنـەی فلانـە لەهـەڵسو کەوتو کردەوەی دا دەق لەو دەچێ ٥ هـــەروا بـــە بـــەردی ریزکـــراوی ئەمبەرو ئەوبەری ڕێگاش دەگوترێ ٥ لەمپەڕو دیوارێـکی قـایمو پتـەوە کەشـــتیو قـــەتارو شـــتی وا لای رادەوەستێندرێن.

**المِرْصَافَةُ**: چەکوچ ٥ (ك: مَرَاصیف).

**أَرْصَقَ بە**: پێوەی نووساند، دەگوترێ: (جـــوز مرصـــق): گوێزێـــکی کـوێرە ناوکەکەی پێوەی نووساوە دەرنایە.

**اِرْتَـصقَ بـە**: پێـوەی نووسا، دەگـوترێ: (جوز مرتَصَق): گوێزێـکە کاکڵەکەی پێوەی نووساوە دەرنایە.

**رَصَنَه رَصْناً**: تـەواوی کـرد، مەحکەمو پتەوی کرد.

**وَصَـــنَ الدّابّـــة**: ولاخەکــەی بــەداخ نیشانەکرد.

**رَصَنَ بلسانه**: بەزوبان جنێوی پێ دا.

**رَصُـــنَ رَصَـــانَةً**: جێـــگیرو پتـــەو بـــوو، دەگــوترێ: (رَصُـنَ البنـاءُ): بیناکـە قایمو پتەو بوو ٥ عاقڵو هۆشمەنـد بــوو ٥ رێــكو پێــكو نایــاب بــوو، دەگـــوترێ: (کـــلام رصـــین، ورأي رصین).

**أَرْصَنَهُ**: جێـگیری کردو چەسپاندی.

**رَصَّنَ**: دەگوترێ: (رَصَّنَ الشَّيْءَ معرفَـةً):

شتەکەی باش زانی ٥ (رَصَّنَ لي هذا الخبرَ): ئەم هەواڵەی بۆیەکالا کردمەوەو لێکۆڵینەوەی باشی تێدا ئەنجام دا.

الرَّاصِنُ: شتی موحکەمو چەسپاو ٥ (ك: رواصِن).

الرَّصين: دەگوترێ: (فلان رصين بحاجتك): فلانکەس شیاوی ئەوەیە پێداویستییەکانت جێبەجێ بکات.

رصين الجوف: ناوسك هێشاو.

المِرْصَنُ: ئاسنێکە گەرم دەکرێو ولاخی پێ داخ دەکرێ ٥ (ك: مراصن).

رصاه رصواً: جێگیری کردو چەسپاندیو جوان دایمەزراند.

أرصى بالمكان: بەو شوێنەوە نووساو بەجێی نەهێشت.

رَضَبَ المَطَرُ رَضْباً: باران دایکردو لافاوی لێ هەڵسا.

رَضَبَ الريق: لیکی چاند، ئاوی دەمی هاتە خوارو هەڵی ملیست.

تَرَضَّبَ الريقَ: تفی هەڵملیست.

الرَّاضِبُ: جۆرە سیدرو بۆنێکی خۆشە.

الرُّضابُ: تفو لیك ٥ یان تفی هەڵملیساو ٥ رەنگی راوی هەنگوین ٥ شەونم کەدەکەوێتە سەرداروو رووەك ٥ تەرزە ٥ میسکی وردو هاڕاو ٥ کلۆ شەکر ٥ گوارا، دەگوترێ: (ماء رُضاب): ئاوی شیرینو گوارا.

المَرْضَبُ: ئاوی دەم کەشیرین بێ ٥ ئاوی دەمی دڵدارو خۆشەویست ٥ (ك: مراضِب).

رَضَخَهُ رَضْخاً: بەبەرد کوتای، وردی کرد، شکاندی، دەگوترێ: (رَضَخَ الحصى والنوى): یان (رَضَخَ رأسه).

ارتَضَخَ منه: عوزری بۆهێنایەوە.

تَرَضَّخَ الخُبْزَ ونحوه: نانەکەی وردو هاڕکرد.

الرَّضْخ: بەخششی کەم ٥ شتی ناوازە، ئەوەی لەناوکی بادامو گوێزو شتی وا پەیدا دەبێ، دەگوترێ: (بلغنا رَضْخٌ من خبر): کەمێك لەهەواڵەکەمان پێ گەیی.

الرُّضْخُ: دەنکی کوتراوو شکێنراو، یان ئەو دەنکانەی لە سندۆڵەکە دەپرژێنو لەملاو ئەولا دەکەون.

الرُّضْخَةُ: ئەو دەنکانەی دەپرژێن لەژێر دەسکە سندۆڵەکە.

المِرْضاخ: دەسکە سندۆڵ، ئەوەی شتی پێ دەکوترێ.

رَضَخَتِ التَّيوسُ رَضْخاً: نێریە کێویەکان شەرە قۆچیان کرد.

رَضَخَ به الأرضَ: بەزەوی دا دا.

رَضَخَ له من ماله: لەماڵو سامانی خۆی شتێکی کەمی دایە.

وَضَخَ الشَّيْءَ اليابسَ: شته وشكەكەی تێك شكاندو هاڕی.
أرضَخَ له: شتی زۆر كەمی پێدا.
رَاضَخَ منه شيئاً: شتێكی لێ دەسكەوت.
رَاضَخَ فلاناً: بەردە بارانی فلانكەسی كرد، بەردی تێگرت.
إرْتَضَخَ: دەگوترێ: (هو يرتضخ لكنة أعجمية): لەقسە كردنی دا شێوە بێگانەیی زمانی عەرەبی پێوە دیارە ٥ یان زمانی تێكەڵاوە لەوشەی عەرەبی‌و ناعەرەبی.
تراضخوا بالسهام: تیریان لەیەك گرت، یەكتریان تیرە باران كرد.
تَرَضَّخَ الخُبْزَ ونحوه: نانەكەی ورد كردو خواردی.
تَرَضَّخَ الخَبَرَ: هەواڵەكەی بیست بەڵام لێی دڵنیا نەبوو.
الرُّضَاخَةُ: بەخششی كەم.
الرُّضْخُ: بەمانا (الرُّضاخَةُ) دێ ٥ شتی كەم‌و كوڕ، هەواڵێك ببیسی‌و لێی دڵنیا نەبی.
الرُّضْخَةُ: بەمانا (الرُّضخ)دێ.
الرَّضيخَةُ: بەمانا (الرّضاخة)دێ.
المِرْضَاخُ: ئامێری گەنم كوتان‌و نۆك كوتان‌و شتی وا.
المِرْضَخَةُ: بەمانا (المرضاخ)دێ ٥ (ك: مراضخ).

رضْرَضَهُ: توێكڵەكەی لێ كردەوەو چاك نەیكوتا.
تَرَضْرَضَ: شكاندی‌و وردی كرد ٥ جوڵایەوەو ڕایوەشاند.
الرَّضْرَاضُ: بەردە وردەی ناو ڕێڕەوی ئاو ٥ دڵۆپە بارانی ورد ٥ گۆشتن ٥ دەگوترێ: (رجل رضراض) و(ردف رضراض): پیاوی گۆشتن، سمتی گۆشتن.
الرُّضراضَةُ: مێینەی (الرّضراض) ٥ بەرد كە دەهاوێژرێ‌و هەڵبەزو دابەز دەكا.
الرُّضْرَضُ: بەردی بچوك لەڕێڕەوی ئاوی كارێزدا.
رَضَّهُ رَضّاً: كوتای توێكڵەكەی لێ كردەوە، یان شكاندی‌و وردی كرد.
أرَضَّ: قونگران‌و تەمبەڵ بوو.
أرَضَّ في الأرض: بەزەوی دا ڕۆیی.
أرَضَّ التعبُ وغيرهُ العَرَقَ: ماندویەتی عەرەقی پێ كرد.
إرْتَضَّ الشَّيْءُ: شتەكە شكا.
الأرَضُّ: ئادەمیزادی لەجێدا كەوتوو كەجێگای خۆی جی نەهێڵێ.
الرُّضَاضُ: ئامێری شكێنەر، وردكەر.
الرَّضُّ: خورما دەنكەكەی دەربهێندرێ‌و ورد بكرێ‌و پاشان تێكەڵاوی ماست بكرێ، یان خورماو ڕۆنەكەرە تێكەڵ بكرێ.

**المُرضَّةُ**: هەرشتێك ببێتە هۆی عەرەقکردنو جەستەی ئادەمیزاد گەرم دابێنێ لەخواردنو خواردنەوە ٥ ماستی ترش، دۆی ترش.

**المِرَضَّةُ**: بەمانا (الرُّضُ)دێ ٥ ماستو دۆی ترش، کەعەرەق بەئینسان بکا.

**رَضَعَ** رضاعَةً: خو خراپ بوو ناکەس بەچە بوو.

**رَضَعَ أُمَّهُ** رضعاً ورضاعةً ورضاعاً: گۆی مەمکی دایکی مژیو شیری خوارد، دەشگوترێ: (رضع الثدي)، دەشگوترێ: (هو يرضع الدنيا ويَذمّها): بەرو بومی دونیا دەخواو زەمی دەکا.

**رَضِعَهَا رَضَعاً**: بەمانا (رَضَعَها) دێ ٥ (هو رَضِعٌ وهي رَضِعَةٌ).

**رَضُعَ** رضاعةً: خو خراپ بوون دەگوترێ: (لَؤُمَ وَرَضُعَ): بۆ کەسێك گوانی ئاژەڵەکە بمژێ نەك بیدۆشێ مژینەکەشی لەترسی ئەومیە نەوەکوو خەڵکی گوێیان لێ بێو داوای شیری لێ بکەن.

**أرضَعَتِ الأمُّ**: دایکەکە منداڵی هەبوو شیری دەدایە.

**أرْضَعَ الولَدَ**: منداڵەکەی والێ کرد شیرەکە بخوا.

**راضَعَهُ مُراضَعَةً ورضاعاً**: شیری لەگەڵ دا خوارد ٥ دایە دەست دایەنێك شیری بداتێ.

**راضَعَ الطفلُ**: منداڵەکە شیری دایکی دەخواردو دایکەکەش سکی هەبوو.

**إرْتَضعها**: بەمانا (رضعها)دێ، دەشگوترێ: (إرْتَضَعَ الثدي أو الضّرعَ).

**إرْتَضَعت العَنْزُ**: بزنەکە شیری خۆی خواردەوە.

**تراضَعاً**: دوو منداڵەکە بەیەکەوە شیریان خوارد.

**استرضَعَ الولَدَ**: داوای کرد شیردەرێك بۆ منداڵەکەی پەیدابکرێ.

**استرضَعَ المرأةَ المولودُ**: منداڵەکە داوای کرد ئافرەتەکە شیری بداتێ.

**الراضِعُ**: سواڵکەر ٥ خوێڕیو هەتیو مچە ٥ خاوەن شیر کەدەکاتە مێردی ژنە شیردەرەکە.

**الراضِعَةُ**: مێینەی (الراضع)ە ٥ ددانی پێشەوەی منداڵ کە بۆشیر مژین پشتیان پێ دەبەستێ، یان ئەو ددانانەی لەماوەی شیرخواردن دا دەکەون.

**الرِّضاع**: دەگوترێ: (بينهما رضاع اللبن) برای شیری یەکترن.

**الرَّضاعَةُ**: شیر خواردن، شیر پێدان.

**الرُّضَعُ**: پورە هەنگ یان هەنگی بچکۆلە.

الرِّضْــعُ: درەختێــکە حوشــتر حــەزی لەگەڵاکەیەتی.

الرَّضُـــوعَةُ: بــەمانا (المُرْضِـــعَةُ) دێ، دەگوترێ: (شاة رضوعة).

الرَّضيع: بەمانا (الرّاضِعُ)دێ، دەگوترێ: (فــلان رضــيعي): فلانكــەس بــرای شیریمە.

المِرْضَـعَةُ: ئامێرێــکە منــداڵ شــیری لــێ دەخوا (مەمەی شیر).

رَضَــفَ رَضْــفاً: لەســەر بــەردی سورکراوە برژانــدێ، کوڵانــدی، گــەرمی کــرد، پێــی گەیانــد ٥ لەســەر بــەردی سورکراوە داخی کرد.

رَضَفَ الوسادةَ: سەرین‌و پشتییەکەی دوو لۆ هێنایەوە.

رَضْـفَةُ: بـەمانا (رَضَــفَةُ)دێ، دەگـوترێ: (رضْفَةُ): واتــە ڕقــی هەڵساند تــاوای لــێ کــرد دەتگــوت لەســەر بــەردی گەرم‌و سورەوە بووە.

الرَّضْفَةُ: بەردی سورەوە بوو گەرم کراو بــەئاگر ٥ دەگــوترێ: (هــو علــى الرَّضْفِ): ئەو دەڵێی لەسەر بەردی سـوورەوە بــووە ٥ حــەجمینی نیــەو هــەدا نــادا ٥ یــان بەڵایــەکی هێنــد گەورەیــە بــەڵاو ناخۆشــییەکانی لەوەپێــشی لــەبیر بردنــەوە ٥ هــەروا بــەز کەکەوتــە ســەربەردی گــەرم

دەتوێتــەوەو گەرمییەکــەی ســارد دەکاتەوە ٥ ئێسقانی قاوغە ئەژنۆ.

المِرْضافَةَ: بەردی گەرم‌و سورەوە بــوو کەئاژەڵی پێ داخ بکرێ.

أَرْضَـــكَ عينيـــه: چــاوی قوچــاندو کردنیەوە.

رَضَــمَ رَضْــماً ورَضَــماناً: قــونگران بــوو، بەتەمبــەڵی هــەنگاوی هــەڵێنان‌و هەنگاوەکانی کورت هاویشتن.

رَضَمَ بالمكــان رَضْــماً ورضــوماً: لەوشــوێنە جێگیر بوو.

رَضَمَ البعيرُ ونحوه بنفسه: حوشترەکە یان شتێکی تر خۆی دابەزەوی داو لــێ پاڵکەوت.

رَضَــمَ البَيْــتَ: خانوەکــەی بەبــەردی سپی بنیــات نــا، دەگــوترێ: (رضــم عليــه الحجــرَ): بــەردی لەســەر کەڵەکــە کردن.

رَضَمَ المتاعَ: کاڵاکەی ڕیزکردن‌و لەسەریەك هەڵی چنی.

رَضَـــمَ الأرْضَ: زەوییەکــەی کــێڵا بــۆ کشتوکاڵ.

اِرْتَضَمَ الشَّيْئُ: شتەکە هەندێکی چووە پاڵ هەندێکی‌و چەسپ بوو ٥ تێــك ترنجا ٥ شکاو کەرت کەرت بوو.

الرُّضامُ: دەگــوترێ: (رضــام مــن نبــت): کەمێـــــك لـــــەڕوەك‌و گیاوگـــــز.

**الرَّضْمُ**: بەردی سپی ٥ یان تاشەبەردی گەورە کە هەندێکیان کەوتبنە سەر هەندێکیان.

**الرَّضَمَةُ**: بەرد، یان گاشە بەردی گەورە ٥ (ك: رَضَمٌ، رِضامٌ).

**الرَّضَمَةُ**: بەمانا (الرَّضْمَةُ)دێ.

**المرضوم**: دەگوترێ: (برذون مرضوم العصَبَ): وڵاخێکی نا رەسەنە، ڕەگەکانی جەستەی سواری یەکتر بوون ڕۆینی بۆناکرێ.

**رَضَنَهُ رَضْناً**: هەندێکی خستە پاڵ هەندێکی تری ٥ یان ڕیزی کردو هەڵی چنی.

**رضاه رَضْواً**: زۆر تر لێی رازی بوو، دەگوترێ: (راضاني فَرَضَوتُهُ): لەکاتی لێك رازی بوون دا بەسەر یا زاڵ بووم.

**رَضِيَهُ وبه وعنه وعليه رضاً ورضاءً ورضواناً**: هەڵی بژاردو پێی رازی بوو، پەسەندی کرد، دەگوترێ: (رضيه لـه): بەشایەنی زانی بۆئەو کارە.

**أرضاه**: وای لێ کرد رازی ببێ، دەگوترێ: (أرضيته عني): وام لێ کرد لێم رازی بێ.

**راضاه مراضاةً ورِضاءً**: هاوڕابوو لەگەڵیاو رازی کرد ٥ پێشبڕکێیان کرد لەڕازی کردنی یەکتر دا.

**إرتضاه**: بەمانا (رَضِيَهُ) دێ، دەگوترێ: (إرتضاه لصحبته): هەڵی بژارد بۆ هاوڕێیەتی ٥ بەشیاوی زانی بۆ هاوڕێیەتی.

**تراضیا**: هاوڕابوون، بەیەکتر ڕازی بوون.

**تَرَضّاه**: هەوڵی بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئەوی دا، یان بەنارەحەتیو زەحمەت رازی بوو.

**استرضاه**: هەوڵی ڕەزامەندی ئەوی دا ٥ داوای لێ کرد رازی بکا.

**الرِّضا**: رەزامەندی.

**الرِّضاءُ**: بەمانا (الرِّضا) دێ.

**الرَّضِيُّ**: فەرمانبەردارو ملکەچ.

**رَطَأَهُ رَطْئاً**: شتێکی خستە ئەستۆی کەپێی ناخۆش بوو.

**رطِئَ رَطْأً**: ئەحمەقو گێل بوو.

**استرطأ**: ئەحمەق بوو ٥

**استرطأ فلاناً**: فلانکەسی ئەحمەقو خوێڕی کرد.

**رَطَبَ البُسْرُ رَطوباً**: خورماکە پێگەیی ٥ تامی لەبەر سیلەییەوە گۆڕا بۆ شیرینی.

**رَطَبَ الدّابَةُ**: وڵاخەکە خورمای گەییوی خوارد.

**رَطَبَ فلاناً**: خورمای شیرینو تەڕو تازەی دەرخواردی فلان دا.

**رَطِبَ رطوبةً ورَطابةً**: شێی هێنایەوە، تەڕ

بوو، پاراو بوو، دەگوترێ: (لساني رطب بذكرك): زوبانم پاراوە پەیادی تۆ.
رَطِبَ فلان رَطْباً: فلانكەس ئەوەی لای بوو لەراست و چەوت راینواند و دركاندی.
رَطُبَ رطوبةً ورطابةً: بەمانا (رَطِبَ)دێ، نەرم و نیان بوو.
رَطُبَ الهواءُ رطوبةً: هەوا بوخاری زۆر بوو.
رَطُبَ البُسْرُ: خورماكە گەیی و شیرین بوو.
أَرْطَبَ البُسْرُ: خورماكە بوو بە روتاب، یان تەڕی و شیرینی تێكەوت.
أَرطَبَ فلانٌ: فلانكەس خورمای گەیی و تازەی زۆر بوو ٥ خورماكە بوو بە روتاب، یان تەڕی و شیرینی تێكەوت.
أَرطَبَ النخلُ: درەختی خورماكە خورماكانی پێگەیی و شیرین بوو ٥ خورماكە بوو بە روتاب، یان تەڕی و شیرینی تێكەوت ٥
أَرطَبَ الأرضُ: زەوییەكە خورمای روتابی زۆر بوو یان هەیبوو.
أَرطَبَ الثوبَ وغیرهُ: كراسەكەی تەڕكرد.
رَطَّبَ البُسْرُ: بەمانا (ارطب)دێ.
أَرطَبَ الشَّيْءَ: شتەكەی تەڕكرد.
أَرطَبَ فلاناً: خورمای روتابی دەرخواردی فلان دا.

تَرَطَّبَ: تەڕبوو، دەشگوترێ: (تَرطّب لساني بذكرك): زوبانم بەیادی تۆ پاراو بوو.
الرَّطْبُ: نەرم و نیان ٥ تەڕ، پێچەوانەی وشك، دەگوترێ: (غلام رطب): كوڕێكە نازو نوزی ژنانە دەكا ٥ هەروا ناوە بۆ هەرشتێك بەئاو تەڕبكرێ ٥ هەموو شۆڕكێكی تەڕ.
الرُّطُبُ: لەوەڕگای سەوزو داراستاناوی ٥ بەشێك لەو جۆرە لەوەڕگایەی بەگیاو گژو درەختی سەوز خۆی دەنوێنێ.
الرُّطَبُ: خورمای گەییو پێش ئەوەی وشك بێتەوە ٥ (ك: أرطاب، رطاب).
الرَّطْبَةُ: مێینەی (الرَّطب) ٥ (جارية رطبة): كەنیزەكی نەرم و نۆڵ یان بێ ڕەوشت ٥ هەر ڕوەكێك بەتەڕی بخورێ.
الرَّطیبُ: (غصن رطيب وريش رطيب): لقی درەخت كەزۆر تەڕو شلك بێ ٥ پەڕو پۆڵی نەرم و نیان.
المَرْطَبَةُ: دەگوترێ: (بئر مرطبةٌ) بیرێك كەلەناو بیرەكانی تردا ئاوەكەی شیرین بێ.
الرُّطْراطُ: ئاوی بەرماوەی حوشتر لەبنكی حەوزدا.
رَطَسَهُ رُطْساً: شەبلاغەی لێ دا.

ارْطَسَّت عليه الحجارة: بەردی لەسەر هەڵچنی.

أَرَطَّ: ئەحمەقو گێل بوو ٥ ماخۆلانی تێکەوتو هاواری کرد، هەراو هۆریای نایەوە.

أَرَطَّ في مقعده: زۆرمایەوەو ئەوشوێنەی جێ نەهێشت.

الـرُّطيط: کەسێك بکەوێتە هەڵبەزو دابەزو هاتو هاوارکردن ٥ گێلیو ئەحمەقی ٥ (ك: رِطَاط، رَطَائِط).

رَطَلَ رَطْلاً: بازی دا.

رَطَلَ الشَّيْءَ: بەدەست هەڵی سەنگاند بزانێ کێشی چەندە.

أرطل فلان: فلانکەس منداڵێکی زەعیفو لاوازو نەکامڵی بوو ٥ شلو شێواو بوو ٥ گوێچکەکانی شۆڕبوونەوە.

راطَلَهُ: بەکێشی ریطل کالاکەی پێ فرۆشت.

رَطَّلَ الشَّعْرَ: قژەکانی بەڕۆن چەورکردو نەرمی کردن ٥ قژەکانی هەڵدایەوە ٥ دایهێنانو شۆڕی کردنەوە.

استَرْطَلَهُ: داوای لێ کرد بەکێشی ریطل شتی پێ بفرۆشێ.

الرِّطْلُ: کێشێکە شتی پێ دەپێورێ یان دەکێشرێ ٥ بەگوێرەی دابو نەریتی ولاتەکان دەگۆڕێ ٥ بۆنمونە لە میصر ١٢ ئۆقیەیە، ئۆقیەش وەزنی دوانزە دیرهەمە ٥ نەرمو نیان ٥ هەرشتێك مەیلەو نەرمو شلك بێ ٥ پیری زەعیفو رەق ٥ منداڵی باریکی بالا بەرز ٥ ئەحمەق ٥ (ك: أرطال).

رَطَمَهُ رَطْماً: قوڕاوی کرد لەقوڕی هەڵکێشا ٥ لەقوڕی وەردا، دەگوترێ: (رَطَمَهُ في الوحل): خستیە ناو قوڕەوە ٥ (رَطَمَهُ في الأمر): خستیە ناو کێشەیەکەوە زۆر زەحمەتە لێی رزگار بێ ٥ بەندی کرد، گیری پێ خوارد.

رُطِمَ رَطْماً: ئەوەی لەناو سکی دا بوو گیری خوارد ٥ قەبز بوو.

أرْطَمَ: بێدەنگ بوو.

إرْتَطَمَ: کەوتە ناو قوڕەوە، لەقوڕ چەقی.

إرْتَطَمَ الشَّيْءَ: شتەکە قەرەباڵغ بوو ٥ کەوتە سەریەك.

إرْتَطَمَ فيه: کەوتو تێکیەوە هاویشتو نەیزانی چی بکا.

تَرَاطَمَ: کەوتە سەریەك.

تَرَطَّمَ السَّلْحَ: قەبزی کرد، گوی گیرا، میزی گیرا.

الـرَّاطِمُ: تایبەتمەندی شت.

**الرُّطام**: گیربوونی خۆراك لەگەدەی حوشتر دا، واتە: حوشترەکە یان هەر ئاژەڵێکی تر کە پیسایی بۆنەکری.
**الرُّطْمَةُ**: ئەو چورتمو کێشەیەی تیی دەکەوێ، دەگوترێ: (وقع في رُطْمَةٍ): کەوتۆتە کێشەیەکەوە ئەمسەرەو سەری نازانێو هەرچەندە دەکا لیی رزگار نابێ.
**الرُّطُومُ**: ئەحمەقو گێل ◦ ئافرەتێك وانێکی بەئێسقان گیرابێ.
**الرُّطومة**: بەمانا (الرُّطمة)دێ.
**رَطَنَ الأعجمي رطانة**: کابرای ناعەرەب بەلۆغەتو زمانی خۆی قسەی کرد.
**رَطَنَ فلان**: کابرا بەزمانی ناعەرەبی قسەی کرد.
**رَطَنَ لە رَطْناً ورطانة**: بەزوبانێك دوا، کەس لیی حاڵی نەبوو.
**راطَنَهُ مُراطَنَةً ورِطاناً**: بەزمانی ناعەرەب قسەی لەگەڵ کرد.
**الرُّطانَةُ**: ئاخاوتن بەزمانی بێگانەو ناعەرەبی، دەگوترێ: (كَلَّمَهُ بالرُّطانة): قسەی لەگەڵ دا کرد بەزمانی عەجەمی یان بەزمانێك زۆربەی خەڵکەکە لیی حاڵی نەدەبوو.
**الرُّطّانة**: حوشتری زۆر لەگەڵ خاوەنو ماڵە کۆچەرییەکان.

**أرْعَبَتِ الأرْضُ**: زەوییەکە ڕوەکی ئەرەتای لێ ڕوا؛ گیایەکە بۆ دەباغکردن بەکاردێ.
**رَعَبَ رُعْباً**: ترساو لێوە لەرەی پێ کەوت.
**رَعَبَ الوادي**: شیوەکە پڕبوو لەئاو.
**رَعَبَ الحمامَةَ**: کۆترەکە دەنگی بەرز کردەوەو شوێنی لێ هەڵکێشا، دەگوترێ: (رعَبَت في صوتها).
**رَعَبَ فلاناً**: فلانکەسی ترساند ◦ هەڕەشەی لێ کرد.
**رَعَبَ السنامَ**: دوگەکەی بڕی.
**رَعَبَ الحوضَ**: حەوزەکەی پڕکرد.
**رَعَبَ السهمَ**: شوێنی سەرەتیرەکانی شکاند.
**رَعَّبَت الحمامَةُ ترعيباً**: بەمانا (رعبت) دێ.
**رَعَبَ فلاناً**: فلانکەسی ترساند.
**رَعَبَ السهمَ**: شوێنی سەرەتیرەکانی چاك کردەوە.
**إرْتعب**: ترسا.
**الأرْعب**: کورت.
**الرّاعِبِيُّ**: جۆرە کۆترێکە زۆر بەدەنگی بەرز دەخوێنێ، دەگوترێ: (حمامة راعبية).
**الرَّعْبُ**: هەڕەشە ◦ جۆرە سەجعێکی زمانی عەرەبییە.
**الرُّعب من السهم**: ئەو شوێنەیە سەرەتیرەکانی تێوە دەچن.

**الرّعيبُ**: دەگوترێ: (هو رعيب العين): چاو ترساوە ○ بۆهەرشتێك بڕوانێ لێی دەترسێ ○ دوگی حوشتر کەشیتاڵ شیتاڵ کرابێ ○ فەڵەویێك کەچەوری لێ بچۆڕێتەوە (سَنام رعيب) پتەو، گۆشتن ○ کورتە باڵا.

**الترعابَةُ**: زۆر ترسنۆك.

**الترعيبة**: پارچە دووگی حوشتر ○ (ك: ترعيب، تراعيب).

**المَرْعَبَةُ**: شوێنی ترس ○ بازو هەڵمەت بردنی ترسناك ○ وەکوو ئەوە بەنەخافڵ یەکێك پەلامارت بداو لێی بترسی.

**رَعْبَبَ**: فەڵەو بوو وای لێ هات رۆنی لێ دەتکا.

**الرُّعْبَبُ**: سەرەتای دەرکەوتنی خورما.

**الرُّعبوبُ**: زەعیفو ترسنۆك ○ سوكو چەپلەر ○ ئافرەتی تازە پێگەیشتوی باڵا بەرزی گۆشتنو نەرمو نۆڵ ○ یان ئافرەتی سپی پێستی جوانو نەرمو نۆڵ ○ (ك: رعابيب).

**الرُّعْبِبُ مِن النساء**: بەمانا (الرُّعبوب)ە ○ (ك: رعابيب).

**رَعْبَلَ**: ئافرەتی سەر ڕەقو ئەحمەق.

**رَعْبَلَ الشَّيْئَ**: شتەکەی پارچە پارچە کرد، شڕو ونجڕو ونجڕی کرد ○ لەحەدیث دا هاتووە: (إنّ أهل يمامة، رَعْبَلوا فسطاط خالد بالسيوف)، دەگوترێ: (رعبل اللحمَ): گۆشتەکەی کوتکوت کرد بۆ ئەوەی زوو ببرژێ.

**تَرَعْبَلَ**: پارچە پارچە بوو ○ کوتکوت بوو.

**الرُّعبلُ**: ئافرەتی دەنگو دۆرە ناخۆشو ئەحمەق، ئەو ئافرەتەی پۆشاکی زبرو ناشیرین دەپۆشێ ○ زیندەوەری قەبارە زلو گەورە، دەگوترێ: (جمل رعبل).

**الرُّعْبَلَةُ**: گێژەڵوکەو خوارو خێچ، دەگوترێ: (ريح رعبلة): بایەکی ناڕێکو پێکو گێژەڵوکە ئاسایە.

**الرُّعبولَةُ**: پارچە قوماشی دڕاو، دەگوترێ: (ثوب رعابيل): کراسێکی شڕو وڕو دڕاوە.

**رَعَثَتِ العَنَزُ او الشاةُ رعثاً**: دەورو بەری سپی واشەیە، بزنەکە یان مەڕەکە لبۆز بەڵەکە.

**رَعَثَتِ الحَيَّةُ فلاناً**: مارەکە فلانی گەست، کەمێك پێوەی دا.

**رَعِثَتِ العَنْزُ أو الشاةُ رعثاً**: بەمانا (رَعَثَتْ)ە ○ (هو أرعث وهي رعثاء).

**رَعَّثَها**: گوارەی لەگوێ کرد، ملەوانکەی لەمل کرد.

الرَّعـثُ: گـواره يـان هەرشتێـك بـۆ جـوانكردنو رازاندنـەوە بـەخۆدا بكرێ ٥ وەكـوو گـوارەو ملەوانكـەو گێـزو گوڵنكـە ٥ گۆشـتە زيادەيەكـە بەسـەر سـەری هەنـدێ باڵندەوەيـە يان بەسەر دەندوكيەوەتی.

الأرعُوثة: ئـەو بـەردەی لەسـەر لێواری بیر دادەنرێو ئاو هەڵكێش لەسەری رادەوەستێ.

رعث الرمان: گوڵوكە هەنار.

رَعَـجَ البَـرْقُ رَعَجـاً: هـەورە بروسـكەكە پێـچاو پێـچی كـردو پرتـەوو بریسكەكەی زۆر مایەوە.

رَعَجَ فلاناً: فلانكەسی دەوڵەمەند كرد.

رَعِجَ: زۆر بوو.

أرْعَجَ البَرْقُ ونحوه: بەمانا (رَعَجَ)دێ.

أرْعَجَ فلان: فلان دەوڵەمەند بوو.

ارْتَعَـجَ: بـەمانا (رَعِـجَ)دێ ٥ كەوتـە پەلـەقاژەو لـەرزینو مـاخۆلانی پێكەوت.

ارْتَعَجَ الوادي: شیوەكە پڕبوو.

الرَّعْجُ: مەڕو بزنی زۆر.

رَعَـدَ الـسحابُ رَعْـداً ورُعُـوداً: هەورەكە گۆلانـدیو بـارانی بارانـد، دەشگوترێ: (هەڕەشەی لێ كرد).

رَعَـدَتْ المـرأةُ: ئافرەتەكـە خـۆی رازاندەوەو خۆی جوانكرد.

رُعِدَ رَعْداً: لەرزینو ماخۆلانی تێ كەوت.

أرْعَدَ: بەمانا (رَعَدَ) دێ.

أرْعَدَ لە: هەڕەشەی لـێ كـرد ٥ تـرسو دڵـەكوتێی تـوش هـات ٥ گـوێی لەگۆڵەی هەور بوو.

أرْعَدَت المرأة: بەمانا (رَعَدَت) دێ.

أرْعَـدَ فـلان: فـلان زۆر ئیلحـاحی كـرد لەسواڵكردنو پرسیاردا ٥

أرْعَدَ فلاناً: وای كرد فلان بلەرزێ.

أُرْعِـدَ فـلان: فـلان جەسـتەی وەشـەقە تۆڵە كەوتو هەموو گیانی لەرزی.

أُرْعِـدَت فرائـصُهُ عنـد الفـزع: هـەموو ماسـولكەو جومـزگاكانی كەوتنـە لەرزە، لەترسا.

ارْتَعَدَ: كەوتە لەرزەو شەقەتۆڵە.

ترعَّـدَ: بـەمانا (ارتعـد) دێ ٥ لەقەڵەوییان جەسـتەی لـەرەی لێـوە دێ.

الرَّاعِـدُ: هـەوری بروسـكاوی ٥ (ذات الرواعد): بەڵاو كارەسات.

الرَّعْدُ: دەنگێكی گەورەیە پەیدا دەبێ دوای بروسـكەو چـەخماخە، دەگـوترێ: (جـاء بـذات الرَّعـد والـصَّلیل): شـەڕو بـەڵاو كارەسـاتی هێنا.

الرِّعْـدَةُ: هەڵـەرزینی جەسـتەیە لەترسان یان بـەهۆی تـاوو لـەرزەوە، یان هۆكاری تر.

الرَّعاد: هەورێك زۆر بروسكە بهاوێ ٥

کەسێك زۆر بڵێو چەقە چەناو بێ ٥ جۆرە ماسییەکە هەرکاتێ ئادەمیزاد دەستی لێ بدا دەستی دەکەوێتە لەرزین تا ماسییەکە زیندو بێ ئەو لەرزینە بەردەوام دەبێ، ئەو جۆرە ماسییە لەروبارەکانی کیشوەری ئەفریقادا بەتایبەتی روباری نیل دا زۆرە ٥ تاکەکەی (رعادة).

**الرَّعادة**: مێینەی (الرَّعّادة)، دەگوترێ: (سحابة رعادة): هەروا بەمانا زۆر بڵێو چەقە چەناو دێ، دەگوترێ: (رجل رعّادة).

**رَعَدَ**: زۆری پرسیار کرد ئیلحاحی کرد لەسواڵکردن دا.

**تَرَعَّدَ**: لەرزایگرتو جەستەی وشەقەتۆڵە کەوت.

**تَرَعَّدَ الشَّيْءُ**: شتەکە راتڵەقاو کەوتە هەژان.

**الرِّعديد**: کەسێك لەکاتی شەڕو پێکدادان دا بلەرزێو جەستەی وشەقە تۆڵە بکەوێ ٥ ئافرەتی نەرمو شل کەلەبەر نەرمو شلی گۆشتی جەستەی لەرەی لێوە دێ ٥ روەکی نەرمو شلك ٥ (ك: رعادید).

**الرِّعديدةُ**: بەمانا (الرِّعْدید) دێ، چ پیاوبێ چ ژن ٥ (ك: رعادید).

**رَعْرَعَ الشَّيْءَ**: شتەکەی راوەشاند هەڵی تەکاند.

**رَعْرَعَ اللهُ الغلامَ**: خودا ئەو کوڕە لاوەی بەدی هێناوە.

**رَعْرَعَ الدَّابَّةَ**: سواری وڵاخەکە بوو بۆئەوەی رای بێنێ ٥

**تَرَعْرَعَ**: دەگوترێ: (تَرَعْرَعَ الصبيُّ) منداڵەکە جوڵایەوە، گەشەی کردو پێگەیی جەستەی رێكو پێك وەستا ٥ یان خەریکە لەتەمەنی دەساڵە تێدەپەڕێ، یان تێپەڕێ.

**ترعرعت الأسنان**: ددانی وشەقەتۆڵە کەوتن.

**تَرَعْرَعَ الماءُ أو السرابُ**: ئاوەکە یان تراویلکە مۆنجاوی دایەوەو لەپێش چاو بریسکەی داو شۆقی لێ دەرکەوت.

**الرِّعراع**: گەنجی جەستە جوانو رێكو پێك ٥ قەفەزازی درێژ ٥ ترسنۆك.

**الرَّعْرَعُ**: گەنجی رێكو پێكو جوان ٥ ترسنۆك.

**الرُّعْرُعُ**: بەمانا (الرَّعْرَع)دێ.

**رَاعَزَ**: وێك هاتەوە.

**رَاعَزَ فلاناً**: سەر زەنشتی فلانی کرد.

**المَرْعَزُ**: گەندە مۆو توکە وردەی ژێر خوریو موی مەڕو بزن.

**المِرعِزاءُ**: بەمانا (المَرْعَزُ) دێ.

**المِرْعِز**: بەمانا (المَرْعَز) دێ.

**المِرْعِزِيّ**: بەمانا (المَرْعَز) دێ.

**المُمَرْعَزُ**: دەگوترێ: (ثوبٌ مَمَرْعَزٌ):

قوماشێکە لەگەندە موو توکە نەرمەی مەڕو بزن دروستکراوە.

**رَعَسَ** رَعْساً ورَعَسَاناً: جەستەی کەوتە لەرزەو هەژان ٥ بەهێواشی ڕۆیشت، لەبەر ماندویی‌و بێ هێزی بەحاڵ هەنگاوی هەڵێنا ٥ سەری بادا سەری راوەشاند بەهۆی زەعیفی، یان خەواڵویی یان بێ نیشاتی.

**أرْعَسَهُ**: وەلەرزەی خست.

**إرْتَعس**: بەمانا (إرْتَعَش) دێ، واتە لەرزی‌و جەستەی وەشەقەتۆڵە کەوت.

**تَرَعَّسَ**: بەمانا (إرْتَعَسَ) دێ.

**الرَّعَّاسُ**: دەگوترێ: (رُمْحٌ رعّاس): رمبێکی مەوج مەوجەو جەوهەرەکەی شەپۆل دەدا.

**الرّعوس**: دەگوترێ: (هو رعوس): سەری خۆی راناگرێ سەری لۆژە لۆژیەتی یان بەهۆی هەنوژەوە یان بێ هێزی‌و کەم نیشاتی ٥ دەگوترێ: (ناقة رعوس): حوشترێکە خێرا خێرا قاچەکانی هەڵدەهێنێتەوە.

**المِرْعَسُ**: هیچ‌و پوچ‌و خوێری.

**رَعَشَ** رَعْشاً: هەڵلەرزی لێوە لەرەی پێکەوت، جەستەی وەشەقەتۆڵە هات.

**رَعِشَ** رَعَشاً: بەمانا (رَعَشَ)دێ.

**رُعِشَ**: توشی لێوە لەرەو لەرزین بووە.

**أرْعَشَهُ**: وای لێکرد بلەرزێ‌و وەشەقەتۆڵە بکەوێ، دەگوترێ: (أُرْعِشَتْ يداه): دەستی لەرزۆك بوون.

**رَعَّشَهُ**: بەمانا (أرْعَشَهُ) دێ.

**إرْتَعَشَ**: بەمانا (رَعِشَ)دێ.

**الرُّعَاش**: هەڵ لەرزین ٥ لەرزۆکییەکە بەهۆی نەخۆشییەوە توشی ئادەمیزاد دەبێ‌و خۆی بۆ زەوت ناکرێ حەجمینی نابێ ٥ نەخۆشییەکی دەماری‌و ئەعصابە یان میکرۆبییە توشی مەڕ دەبێ.

**الرُّعاشيّ**: (الشلل الرعاشي): نەخۆشییە بەهۆیەوە ماسولکەکان زەعیف‌و رەق دەبن جەستە توشی لەرزین دەبێ ٥ هەروا ماسولکەکان ئازاریان دەبێ‌و ئادەمیزادەکە توشی تورە بون‌و رارایی دەکا.

**الرُّعِشُ**: ترسنۆك لەشەڕدا، لەماڵبەخشین دا ٥ (ظليم رَعِشٌ): شتورمورغێکی مل درێژە، یان خێرا رۆیە.

**الرُّعْشَاءُ**: دەگوترێ: (دابة رعشاءُ): وڵاغێکە سرکە لەبەر تەڕدەماخی خۆی هەر هەڵبەزو دابەزیەتی، یان لەکاتی رۆیشتن لەبەر خۆشڕەوی

خۆی هەموو جەستەی دەلەرێتەوە ٥ مل درێژ، تیز ڕەو ٥ (ك: رُعْشٌ).

**الرَّعْشَةُ**: لەرزین‌و هەستکردن بەخۆشی یان ناخۆشی.

**الرِّعْشَةُ**: بەمانا (الرَّعْشَةُ) دێ ٥ خێرایی‌و پەلەکردن دەگوترێ: (به رعشة الى لقاء العدو).

**الرِّعيش**: لەرزۆك، شەپلە لێ دراو.

**المُرْعَشُ**: جۆرە کۆترێکە بەزۆری بەحەواوە دەفڕێ‌و کەم هەدا دەدا.

**الرِّعْشِيشُ**: ترسنۆك ٥ ئەوکەسەی لەشەڕدا لەترسان لێوە لەرەی پێ دەکەوێ ٥ (ك: رعاشیش).

**الرُّعْشَنُ**: لەرزۆك‌و شەپلە لێ دراو، دەگوترێ: (جمل رُعْشَنٌ): حوشترێکی خۆشڕەوە لەکاتی رۆیشتن دا لەرەی لێوەدێ ٥ ترسنۆك‌و نەوێر.

**رَعَصَ رَعْصاً**: لەرزی‌و کەوتە جم‌و جۆڵ‌و هەڵبەزو دابەزو خۆراوەشاندن، دەگوترێ: (رَعَصَ البَرْقُ): بروسکەکە پێچاو پێچی کرد ٥ (رَعَصَ علیه جلده): پێستەکەی لەرزییەوە.

**رَعَصَ الشَّيْءَ**: شتەکەی راوەشاند هەڵی تەکاند ٥ بۆلای خۆی ڕای تەکاند.

**أَرْعَصَهُ**: بەمانا (رَعَصَهُ) دێ.

**اِرْتَعَصَ**: هەڵلەرزی، خۆی ڕاوەشاند، وەشەقەتۆڵە هات ٥ خوار بۆوەو دولاهاتەوە، دەگوترێ: (ارْتَعَصَ البرقُ): هەورە بروسکەکە پێچاوپێچ لەمەعانی دا.

**ارْتَعَصَ السعرُ**: نرخەکە بەرز بۆوە.

**ارْتَعَصَ الجِدْيُ**: کارژیلەکە لەتەڕدەماخی دا هەڵبەزو دابەزی کردو بازی دا.

**تَرَعَّصَ**: بەمانا (ارْتَعَصَ)دێ.

**رَعَضَ رَعْضاً**: بەمانا (رَعَصَ)دێ، واتە خۆی راوەشاند لەرزی‌و کەوتە جم‌و جۆڵ.

**أرعَضَهُ**: بەمانا (رَعَضَهُ) دێ.

**إرْتَعَضَ**: بەمانا (رَعَضَ)دێ.

**رَعَظَ السَّهْمَ رعظاً**: تیردانی بۆ تیرەکان دروست کرد ٥ کونێکی لەتیرو کەوانەکەدا دروست کرد بۆ ئەوەی تیرەکانی لێوە بخاتە سەر پێ ٥ لای تیردانەکەی توند شەتەك دا.

**أَرْعَظَهُ**: شوێن تیری بۆ تیرو کەوانەکە دروست کرد.

**أَرْعَظَ فلاناً عن الأمر**: فلانکەسی لەکارەکە دابڕی.

**رَعَّظَهُ**: وەجم‌و جوڵی خست، دەگوترێ: (رَعَّظَ الأصبع): قامکەکانی جولاندن بۆئەوەی بزانێ کامیان ئیش ناکا.

**رَعَّظَ الوَتَدَ**: سنگەکەی لەقاند بۆئەوەی دەری بهێنێ.

**تَرَعَّظَ**: بۆ موطاوەعەی (رَعَظَـهُ) دێ ٥ خۆی لـێ بوارد ویستی خۆی لـێ رزگار بکا.

**الـرُّعْظُ**: ئـەو شوێنەی تیرەکانی لێوە دەخرێنە سەرێ بۆ هاویشتن.

**رَعَّ رعًا**: دامرکاو هێدی بۆوە.

**الرُّعاع من الناس**: هەرچیو پەرچیو بێ سەرو بەر.

**الرُّعاعـة**: کەسێـک بـێ عـەقڵو هۆش بێ.

**رَعَفَ الشَّيْءُ رَعْفـاً ورعافـاً**: شتەکە رەوان بوو، پێش کەوت.

**رَعَفَ فلان أو أنفه**: خوێن لەلوتی هاتـەدەر ٥ خوێنی لوتی بەر بوو.

**رَعَـفَ بفـلان البـابُ**: فلاّنکـەس لـەناکاو لەدەرگا کە چووە ژوورەوە.

**رَعَفَ به**: پێشی خست.

**رَعَفَ السائِرَ**: پێش رێبوارەکە کەوت.

**أرعَفَ الإناء**: قاپەکەی پڕکرد تاله هەر چوارلایەوە لێی رژا.

**ارتَعَفَ**: پێش کەوتو چووە پێش.

**استرعَفَ**: بەمانا (ارتَعَفَ)دێ.

**اسـترعَفَ الـشَّيْءَ**: شـتەکەی داچۆڕانـدو دڵـۆپ دڵـۆپ ئـاوی لــێ هێنـا، دەگـوترێ: (اسـترعف الـشَحْمَةَ): بەزەکـەی توانـدەوە، دڵـۆپ دڵـۆپ چەورییەکەی تکا.

**اسـترعف فلانـاً**: خـوێنی لـەلوتی فلاّنکەس هێنا.

**الأُرْعُوفَـةُ**: کاشـە بەردێـکی گەورەیـە لەسەر بیر دادەنرێ، ئەوکەسەی ئـاو دەردەهێنـێ لەسـەری رادەوەسـتێ ٥ یان بەردەکە لەبنکی بیرەکەدا دەبێ ئەوکەسـەی بیرەکـە پـاك دەکاتـەوە دەچـێتە سـەری، یـان بەردەکـە لـەبنکی بیرەکـەدا دەمێنێتـەوەو لانابرێ.

**الراعِـفُ**: لـوت، یـان نـەرمایی لـوت ٥ لوتکەی شاخ ٥ رمب چونکە ئامێری خـوێن رێژییـە، دەگـوترێ: (رِمَـاحٌ رَواعِف).

**الرُّعاف**: خوێنی پڕاو لـەلوت (خـوێنی دەرهاتو لە لوت) ٥ بارانی زۆر.

**الرُّعافِيُّ**: بەخشندەو سەخی تەبیعەت، کەسێـك زۆر ببەخشێ.

**الرُّعوفُ**: بارانی کەم.

**الرَّعيـــف**: هـــەوری پـــێش هـــەوری باراناوی.

**المَراعِـــفُ**: لـوتو دەورو بـەری لـوت، دەگـوترێ: (ما أحسن مراعِفُ أقلامـه ومقاطرها): چەند دەمو لێوو لوتو چاوی جوانن.

**رَعَقَـتِ الدَابَّـةُ رَعْقـاً ورُعَاقـاً ورعيقـاً**: وڵاخەکە لەکاتی راکـردنو غـاردانی دا ورگی دەنگی لێوەهات.

**الرُّعـاق**: ئـەو دەنگەیـە لە ورگـی وڵاخ

دەبیـــــسرێ لـــــەکاتی ڕۆیـــــشتنی دا (الرَّعِيق): بەمانا (الرُّعاق): دێ.

رَعَّلَه رعلاً: شەقی کرد قەڵاشتی، یان درزەکەی زلترکرد.

رَعِلَ رَعَـلاً ورَعَالـةً: درێـژ بـوو، شل بـوو، داچۆڕا.

رَعِلَ رعالـةً: ئەحمـەق و گێـل بـوو عـەقڵی تێــك چــوو ٥ دەگــوترێ: (كلمـــا إزْدَدْتَ مثالَةً زَادَكَ اللهُ رَعَالَـة) ٥ (هـو أرعلُ وهي رَعْلاءُ).

أرْعَلَت العوسـجةُ: گوێـچکەی ڕوەکـە دەرکەوت، دەگـوترێ: گیایەکە سەری دەرهێنا.

أرْعَــلَ الرَّجُــلَ: زەبرێــکی کوشــندەی ئاڕاستەی پیاوەکە کرد.

رَعَّــلَ الكــرمُ: دارمێوەکــە تــەرزەی دەرکـەوتن، تولـە ناسکەکانی هاتنـە دەر.

استَرْعَلَ: لەگەڵ وەجبەی یەکەم چووە دەر.

اســتَرْعَلَت الماشـيةُ: ئاژەڵـەکان کۆمـەڵ کۆمـەڵ بـوون، دەشـگوترێ: (جــاء القوم مسترعلين): خەڵـکەکە وەجبـە وەجبە هاتن.

الأرعَــلُ: دەگــوترێ: (ثــوب أرعَــلُ): پۆشاکێکی درێژە شۆڕ بۆتـەوە، یان قەراخـەکانی شۆڕبونەوە ٥ (عُـشْبٌ أرْعَلُ): گیایەکە درێژبووە تاوای لـی هــاتووە چــۆماوەتەوە ٥ (ضـــرب أرْعَــلُ): زەبرێــکە گۆشـتی بڕیـوەو گۆشــتەکە شــۆڕبۆتەوە ٥ (غــلامٌ أرْعَلُ): کوڕێکە سوننەت نەکراوە.

الراعِلُ: جۆرە خورمایەکە، یـان جـۆری باشیەتی.

الرُّعالُ: ئەو شتەی لە لوت دێتە دەر.

الرَّعْــلُ: لوتکــەی کێــو ٥ پۆشــاکی ئادەمیزاد، دەگوترێ: (مرَّبَجَرِّ رعله): ڕۆیــشت پۆشـاکەکەی بـەدوخۆی دا ڕادەکێـشا ٥ پـشتی گوێـچکەی ئـاژەڵ کەهەڵبدڕێ.

الرُّعْــلُ: تولـەمێوی ناسـك ٥ سـەرە تەرزەی مێو.

الرَّعلاءُ: مەڕی گوێچکە هەڵدڕاو، یـان گوێچکە درێژ.

الرُّعْلَــةُ: کۆمەڵێــکی کــەم کــە لــە پێــشەوەی کۆمـــەڵی زۆر دەڕۆن ٥ شــوتورمورغ ٥ مــاڵ و منـداڵ یـان خێزانی زۆر، دەگـوترێ: (ترك رعلـة وتــرك عيــالاً رعلـــة) ٥ پێــستی گوێـــــچکەی وڵاخ هەڵـــــدەدڕێ و بـەدواوەی هەڵدەواسـرێ ٥ درەختـی خورمـای زۆر بـەرز ٥ سـەری چوکی نێرینە.

الرُّعلــةُ: دەســکە ڕێحانــەو شــتی وا

کەلەسەر سەر دادەنرێ ◦ تەرزەو تولە مێوی ناسك.

**الرِّعْلَةُ:** (أبو رِعلة): کونیەی گورگە.

**الرُّعْـولِيُّ:** (شـواء رعـولي): چـاك نەبرژاو، کەمبرژاو، باش نەکولاو.

**الرَّعيـلُ:** کۆمـەڵی کـەم لـەپیاوو لـە ئەسـپ، یـان ئـەو کۆمەڵـە کەمـەی پـێش دەکـەوێو دەبێتـە پێشەتای کۆمـەڵی زۆر، دەگـوترێ: (فـلان مـن الرّعیـــل الأول): فلانکـــەس لەپێشینانی ئەو تاقمو کۆمەڵەیە ◦ (ك: رِعال وأرعال).

**المِرْعَـلُ:** شمـشێری برنـدە، دەگـوترێ: (سیف مِرْعَلٌ).

**رَعَمَ** رَعْماً ورُعاماً: چڵمی هاتە خوار.

**رَعَـمَ** المخـاط: لەبـەر کزیو لاوازی چڵمی شۆڕبۆتەوە.

**رَعَمَ** الشَّيْءَ رَعْماً: چاودێری شتەکەی کرد، دەگـوترێ: (رَعَمَ الشمس): چاودێری ئاوابوونی خۆری کرد.

**رَعُمَ** رعامة: بەمانا (رَعَمَ) دێ.

**رَعْمَةُ:** چڵمی ئەوی سرِی.

**الرُّعام:** چاو تێ برِینو زۆر سەیرکردن لەکاتی چاودێری کردنی دا.

**الرُّعامُ:** چڵم ◦ دەردێکیشە توشی لوت دەبـێو ئـاوی پێـوە ناوەسـتێو هەمیـشە چـڵمی دێتـە خـوارەوە نەخۆشییەکی سارییە توشی وڵاخی سمدار دەبێو لـەوەوە بـۆ ئـادەمیزاد دەگوێزرێتـــەوەو کوشـــندەیەو دەیکوژێ.

**الرِّعْمُ:** بەزو پیـو ◦ (ك: رُعوم، أرعام) ◦ (أم رِعْم): کونیەی کەمتیارە.

**الرُّعومُ:** زۆر کـزو لاواز ◦ یـان کەسێـك توشی نەخۆشـی ئـەوە بووبـێ لـوتی چـڵمی پێوەنەوەسـتێو هەمیـشە چڵمی شۆڕ بوبێتەوە.

**رَعَنَ** رُعُونةً: قسەی ناشیرینی کردن.

**رَعَنَـتِ الـشَّمْسُ فلانـاً رعنـاً:** خـۆر لەسەری فلانکەسی داو مێشکی ئازار دا ◦ جەسـتەی شـلو شـێواوبوو بـێ هۆشی بەسەردا هات.

**رَعِنَ** رَعَناً: بەمانا (رَعَنَ) دێ.

**رُعِنَ:** بێ هۆش بوو لەهۆش خۆی چوو.

**الأرعَـنُ:** قـسە تـرِن ◦ دەمو لـەفـظ ناشـیرین ◦ (جـیش أرعـن): سـوپای زۆرو خـاوەن کەرەسـتەی شـەڕ، یـان سـوپایەك لەبـەر زۆری بـێ شمـاری دەڵێی دەریایـەو تێـکەوە دەهاوێ ◦ (جبل أرعن): کێوێـکە لوتکەی زۆرو بەرزی هەن ◦ (رجل أرعـن): پیـاوی لوت درێژە.

**الـرُّعْنُ:** کـارکردنی خـۆر لەمێـشكو ئـازاردانی ◦ لوتکـە شـاخی بـەرز.

**الرّعناءُ:** مێینەی (الأرعن) ٥ جۆرە ترێیەکە لەوڵاتی طائیف، سپییەو بۆڵەکانی درێژن (ترێ تایەفی) ٥ ناوێکی شاری بەصرە یە.

**الرُّعون:** بەهێزو توانا ٥ زۆر جەمو جوڵ کەر (ماخۆلان تێکەوتوو).

**الرُّعونة:** لەزاراوەی صۆفیان دا راوەستان لەبەردەم داخوازییەکانی نەفس.

**رَعَا** عنه رعواً ورعوی: وازی لێهێنا، لێی نەبان بوو ٥

**رَعَا** فلاناً رَعْواً: لێی تورە بوو، ترۆی کرد، گێڕایەوە.

**ارعوی عنه:** بەمانا (رَعَا) دێ.

**الأرعاوِيّة:** ئاژەڵی پاشا کە هەموویان نیشانە کراونو لەوەرگای تایبەتییان هەیە.

**الأُرعُوَةُ:** نێری ئامێری جوتکردنو کێڵان.

**الرُّعاوي:** حوشترێک لەدوورو بەری هۆبەو رەشماڵ بلەوەڕێو لەهەوارگەو نیشینگەی خێڵەکە دوور نەکەوێتەوە.

**الرّعاوِيّة:** ئاژەڵێك بلەوەڕێندرێ بۆ پاشا یان بۆ فرۆشتنو جەڵەبکاری.

**رعت** الماشية رعياً ومرعىً: ئاژەڵەکە بۆخۆی لەوەڕاو شوانی لەگەڵ نەبوو یان پێویستی بەئالیکو ئالف نەبوو.

**رعى** الحيوانُ النباتَ: ئاژەڵەکە گیایەکەی خوارد.

**رعى** الشّيْءَ رعياً ورعايةً: پارێزگاری شتەکەی کرد ٥ چاودێری کرد.

**أرعت الأرضُ:** زەوییەکە لەوەڕی زۆر بوو بەروبومی زۆر بوو.

**أرعى عليه:** هێشتیەوە ٥ بەزەیی پیاهاتەوە ٥ گوێی بۆڕاگرتن دەگوترێ: (فلان لایرعی الی قول أحد): فلان گوێ بۆقسەی کەس راناگرێ.

**رعى** الماشيةَ: ئاژەڵەکانی لەوەڕاندن.

**رعى** اللهُ الماشيةَ: خودا گیاو گژی بۆ ئاژەڵەکان رواند.

**رعى** فلاناً المكانَ: پاوانو لەوەڕگای بۆ ئەو شوێنە دانا.

**رعى** فلاناً سمعه: گوێی بۆ فلان گرتو بەقسەی کرد.

**راعاه** مراعاةً ورِعاءً: مولاحەزەی کرد، چاودێری کرد ٥ دەگوترێ: (راعی الأمرَ): سەرنجی کارەکەی داو چاوەڕوانی سەرەنجامی بوو ٥ چاودێری کردو هێشتیەوە ٥ هەروا بەمانا لەگەڵ لەوەڕان دێ، دەگوترێ: (راعی الجملُ الخروفَ): حوشترەکە لەگەڵ کاوڕەکە لەوەڕا.

راعى فلاناً سَمْعَهُ: گوێی بۆ فلانکەس ڕاگرت ◦ هەروا دەگوترێ: (هو لايراعي اليه): ئەو گوێ ناداتە ئەو.

إرْتعت الماشية: بەمانا (رَعَتْ) دێ.

تَرَعَّتِ الماشيةُ: بەمانا (رَعَتْ)دێ.

استرعاه الشَيْئَ: شتەکەی پاراست، پارێزگاری لی کرد، یان داوای لی کرد چاودێری شتەکە بکا ◦ لەپەندی پێشینان دا هاتووە: (من استرعى الذئب فقد ظلم): کەسێك گورگ بکا بەشوانی مەڕ ستەمکارە.

التُرعايَةُ: کەسێك پیشەی خۆیو باوكو باپیری شوانی بووبێ.

التُرْعِيّ: دەگوترێ: (انه لِتِرْعِيُ مال): زۆر باش سەروکاری ماڵو سامانی خۆی دەکا ◦ یان زۆر بەباشی حوشتر بەخێو دەکا.

التِرْعِيَّةُ: بەمانا (التِرْعِيُ) دێ.

الرّاعي: شوان ◦ هەرکەسێك کاروبارێکی بەدەستەوە بێ، وەکوو فەرمانڕەواو سەرۆك خێڵو سەرۆك خێزان ◦ هەروا بەمانا چاودێرو جاسوس دێ ◦ (ك: رعاة، رُعيان، رِعاء) ◦ (راعي البستان): جۆرە کوللەیەکە ◦ (راعي الجوزاء): و(راعي النعائم): دوو ئەستێرەن.

الراعِيّة: مێینەی (الراعي)یە ◦ (ك: رَوَاعٍ).

راعية الشيب: سەرەتای پیری.

الرِّعايَةُ: پیشەی شوان.

الرُّعوية: نیسبەتە بۆ رەعیەتبوون، دەگوترێ: (فلان من الرعوية العثمانية).

الرُّعْيُ: دەگوترێ: (رعياً لك): واتە خودا بتپارێزێ.

الرِّعْيُ: لەوەڕ، ئەوشتەی ئاژەڵ دەیخوا.

الرِّعْيَةُ: ئەو حاڵەتو چۆنیەتیە کە لە لەوەڕەکەوە دیارە یان چونیەتی هەڵسو کەوتی شوانەکەیە، دەگوترێ: (هو حسن الرِّعية): او (سيئ الرّعية) ◦ هەروا بە زەوییەك دەگوترێ کەبەردی زۆری تێدابێو بەگاسنو شتی وا نەکێڵدرێ ◦ ئەو گیاو گژەی خودا لە لەوەڕگادا دەیڕوێنێ.

الرَّعِيَّةُ: حەیوانی لەوەڕاو، کۆمەڵگایەك کەپیاوێك سەرو کاری کاروباریان بکاو بەرژەوەندییەکانیان بپارێزێ ◦ (ك: رعايا).

المُراعاةُ: (مراعاة النظير): لەزاراوەی زانایانی بەدیع دا بریتییە لە کۆکردنەوەی شت لەگەڵ شتێکی تری موناسیب دا، وەکوو بازاڕو

مامەڵەو دەڵاڵیو کرێ حەماڵی..هتد.

**المَرْعى**: گیاو گژو لەوەڕ ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِي أَخْرَجَ الْمَرْعَى﴾ ٥ پاوانو شوێنی ئاژەڵ لێ لەوەڕان ٥ (ك: مراعٍ).

**الْمَرْعاةُ**: بەمانا (المرعى) دێ.

**رَغِبَ** فلان رَغَباً ورَغْبَةً ورُغْبَةً: سوور بوو لەسەر شتەکەو تەماعی تێیدا بوو.

**رَغِبَ اليه**: لێی پاڕایەوەو پەرستشی بۆکرد.

**رَغِبَ عن الشَّيْءِ**: وازی لەشتەکە هێناو بەئەنقەست دەست بەرداری بوو.

**رَغِبَ بنفسه عن الشَّيْءِ**: خۆی لەوشتە بەرزتر زانی.

**رَغِبَ بنفسه عن فلان**: وای زانی پیاوەتی بەسەر فلانەوە هەیە.

**رَغِبَ بفلان عن كذا**: وایکرد فلان ئەوشتەی نەوێ ٥ پێی ناخۆش بوو بۆ ئەو بێ.

**رَغِبَ الشَّيْءَ وفيه**: ویستی، گەرمکی بوو.

**رَغُبَ رُغْباً ورَغَابَةً**: بەرفراوانو گەورە بوو.

**رَغُبَ الوادي**: شیوەکە گەورە بوو.

**رَغِبَ فلان**: فلانکەس زۆرخۆر بوو، چلێسییەکەی زیادی کرد.

**أَرْغَبَ فلان**: فلان دەوڵەمەند بوو، ماڵو سامانی زۆر بوو.

**أَرْغَبَ فلان فلاناً في الشَّيْءِ**: فلان وایکرد فلانکەس حەزی لەشتەکە بێ.

**أَرْغَبَ عنه**: وای کرد فلان شتی نەوێ، حەزی لی نەبێ، دەگوترێ: (أَرْغَبَ الله قدرك): خودا ڕێزت زیاد بکا.

**رَغَّبَهُ فيه**: وای کرد رەغبەتی بۆی هەبێ ٥ ئەوەی دەیویست دایە دەستی.

**ارْتَغَبَ الحملُ**: حەملەکە قورس بوو کەوتە نۆمانگو نۆ ڕۆژی خۆیەوە.

**ارْتَغَبَ الشَّيْءَ وفيه**: رەغبەتی لەشتەکە بوو، بەدڵی بوو.

**تَرَاغَبَ**: بەرفراوانو گەورە بوو، دەگوترێ: (تراغبوا في الخير).

**الرُّغابُ**: زەوی نەرمەڵان ٥ زەوییەك بارانی زۆری لێ نەبارێ، لافاوی لێ هەڵنەستێ، یان ئەرزی نەرمەڵانو دەشتو بەرفراوان ٥ (ك: رُغُبٌ).

**الرُّغُبُ**: زەوییەك زۆر ئاوخۆر بێ.

**الرُّغْبَانَةُ**: حەبلی نەعل.

**الرَّغِيبُ**: (وادٍ رَغيب): شیوێك زۆر ئاوبگرێ ٥ حەزلێکراو ٥ (رجل رغيب): پیاوێك هەنگاوی درێژ بهاوێو زەوی بپێچێتەوە ٥ (حِمْلٌ رغيب): باری قورس ٥ (ك: رِغاب، رُغُبٌ).

**الرَّغيبة**: مێینەی (الرّغیب)ە ٥ هەروا بەمانا حەزلێکراوە ٥ بەخششی زۆرو زەبەندە ٥ (ك: رغائب)، دەگوترێ: (فلان یفید الغرائب ویفیئ الرّغائب).

**المَرْغَبُ**: حەزو تەماع، ژیانی ناخۆش‌و بوارەکانی ژیان ٥ (ك: مراغب).

**المَرْغَبَةُ**: بەمانا (المَرْغَبُ)دێ.

**رَغَثَ أمُّهُ رَغْثاً**: دایکی شیری دایە.

**رَغَثَ فلاناً**: هەرچی فلانکەس هەیبوو لەرێگای بەخششەوە لێی وەرگرت‌و هیچی پێ نەهێشت ٥ یان زەبردوای زەبر لێی داو تێی سرەواند.

**رُغِثَ رَغْثاً**: هەرچی هەیبوو بەبەخشین لەناوی برد ٥ (هو مرغوث وهي مرغوثة).

**رُغِثَتِ المرأة**: ئافرەتەکە ڕەگی شیری ناو مەمکی ئازاری بوو.

**أرْغَثَتْهُ**: شیری دایە.

**أرْغَثَ فلاناً**: بەمانا (رَغَثَهُ) دێ ٥ یان زەبری لەڕەگی شیر هێنی مەمکی دا.

**الرُّغاثُ**: زەوی نەرمەڵان کەبەبارانی زۆر نەبێ لافاوی لێ هەڵنەستێ.

**الرُّغَثاءُ**: ڕەگێکە لەمەمك دایە شیری لێوە دێتەدەر.

**الرَّغوثُ**: ئافرەتی شیردەر ٥ (ك: رِغاث، رَغائِث).

**رَغِدَ العَيْشُ رَغَداً**: ژیانی خۆش بوو لەهیچ پەکی نەکەوت لەنازو نیعمەت دا گەورە بوو، دەگوترێ: (هو رَغْدٌ وراغِدٌ وأرْغَدُ).

**رَغُدَ العَيْشُ رَغْداً ورَغادَةً**: بەمانا (رَغِدَ)دێ.

**أرْغَدَ**: کەوتە ناو ژیانی خۆش‌و پڕنازو نیعمەتەوە، یان دەوڵەمەند بوو توشی ژیانی خۆش هات.

**أرْغَدَ عَيْشَهُ**: ژیانی خۆش کرد.

**أرْغَدَ الماشِيَةَ**: ئاژەڵەکەی بەرەڵڵاکرد بۆخۆی بە ئارەزوی خۆی بلەوەڕێ.

**استَرْغَدَ العَيْشَ**: ژیانی خۆشی دەستکەوت.

**إرْغادُ اللَّبَنُ**: شیرێکە هەندێکی تێکەڵاو بەهەندێکی بوو باش نەمەیی.

**إرْغادُ فلان**: فلانکەس رەنگی هەڵبزرکاو روخساری گۆڕا بەهۆی نەخۆشی یان رق هەڵسان یان کەم خەوی، دەگوترێ: (إرْغادُ النائمُ): نوستوەکە لەخەو هەڵسا بەخەواڵویی خەو بەری نەدابوو.

**إرْغادٌ في رأيه**: لەبیرو بۆچوون دا ڕاڕایەو هەردەمە لەسەر ڕایەکە

نازانێ چۆن کارو باری خۆی بەرێوە بەرێ.
إرْغادّ الغضبانُ: رق هەڵساوە کە لەبەر زۆری رقەکەی وەڵامی پێ نەدرایەوە.
الرّاغِدُ: ژیان خۆشو بەناز پەروەردە.
الرَّغد من العيش: ئەو کەسەی بەبێ ماندوو بوون ژیانی خۆشی بۆ دابین ببێ، وەکوو ژیانی ناو بەهەشت ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَكُلُواْ مِنْهَا حَيْثُ شِئْتُمْ رَغَداً﴾، دەگوترێ: (هو في رغد من العيش): ئەو لەژیانێکی خۆشو بێ ماندوو بون دایە، رزقو رۆژی زۆرو زەبەندەیە.
الرَّغيد: ژیانی خۆشی بێ کۆسپو نارەحەتی.
الرَّغيدة: مێینەی (الرَّغيد) ٥ شیر بکوڵێندرێ یان ئاردی بەسەرا بکرێ تاوەکوو پەلوی لێ دێ ئەمجار بەکەوچك بخورێ ٥ رۆنەکەرە.
المَرْغَدَةُ: باخ ٥ باغچە ٥ (ك: مراغد).
رَغْرَغ العيشُ: بەمانا (رَغِدَ) دێ.
رَغْرَغ فلان: فلانکەس نقومی نازو نیعمەت بوو توشی خێرو بێری زۆرو زەبەندە بوو.
رَغْرَغت الماشية: ئاژەڵەکە بەئارەزوی خۆی هەموو رۆژێ دەچێ بۆسەر جۆگا بۆئاو خواردنەوە ٥ بەکەیفی خۆی لەدەورو بەری جۆگاکە گیاو گژ دەخواو ئاو دەخواتەوە ٥ بەکوردی خۆمان وەکوو (مانگای مالوان) دەلەوەرێو لەپەناوە ئاو دەخواتەوە.
رَغْرَغ الإبلَ: گیاو گژی مزرەتامی بۆ حوشترەکە داناو ئەویش حەزی لێ ناکا.
رَغْرَغ الأمرَ: نیشەکەی شاردەوە.
المُرَغْرَغُ: ریسو بەنێك نەچندرابێ، پارچە پارچە نەکرابێ.
رَغَسَتِ المرأةُ رَغْساً: ئافرەتەکە منداڵی زۆر بوون.
رَغَسَ اللهُ القَومَ: خودا ئەو نەتەوەیەی زۆرو گەشەدار کرد.
رَغَسَ اللهُ المالَ أو الولدَ: خودا بەرەکەتی خستە ناومالو منداڵەوە.
رَغَسَ اللهُ فلاناً مالاً أو ولداً كثيراً: خودا ماڵو سامانی زۆری بەفلانکەس داو بەرەکەتی خستە ناویەوە یان منداڵی زۆری پێدانو لێیان حەسایەوە ماڵو منداڵی پرخێرو فەربوون.
أرْغَسَ اللهُ المالَ: بەمانا (رَغَسَهُ)دێ.
أرغَسَهُ مالاً: بەرەکەتی بۆ خستە ناو ماڵو سامانەوە.

أَرْغَسَ نَفْسَهُ: خۆشی بۆ خۆی دەستە بەر کرد.

رَغَّسَهُ: بەمانا (أَرْغَسَهُ) دێ.

استرغسَهُ: بێ هێزی کردو چەماندی، نەرمی کرد.

الـرَّغْسُ: خێـرو بەرەکـەتو خۆشـیو هەرزانی.

الـرِّغْسُ: پـزدان، یـان ئەوشـتەی کـە لەگـەڵ منـداڵ دا دێتـەدەر وەکـوو چڵم وایە.

اَلْمُرْغِسُ: ژیانی خـۆشو بـێ کۆسـپو نارەحەتی.

المَرْغوسُ: روخساری گوشادو تەڕو تازەو خێر لـێ وەشاوە ٥

اَلْمَرْغُوسة: تێکەڵو پێکەڵو نالەبار ٥ ئافرەتێـک بەسـکو زابـێ، منـداڵی زۆر ببن.

رَغَـشَ علیـه: دوزمـانی بەسـەرەوە کـرد، ئـاژاوەی نایـەوە، دەگـوترێ: (لا تَرْغَشْ علینا): موشاغەبەمان لەسەر مەکە.

الرَّغیفـةُ: توێـژ (سـەر توێـژی ماسـتو شـیر) ٥ شـیر بکوڵێنـدرێو ئـاردی بەسەردا بکرێ تـاوەکوو پـەڵوی لـێ دێ، جـۆرە خواردنێـکە دەڵـێن دەرمانە بۆ ئافرەتێـک تـازە منـداڵی بـوو بـێ ٥ هـەروا بەخواردنێـکیش دەگوترێ وەکوو پەڵو وایە لـەخورما

دروسـت دەکـرێ ٥ هـەویری شـل ٥ گیای نەرم ٥ ژیانی بەختەوەر.

رَغَفَ العجینَ ونحوه رَغْفاً: هەویرەکەی کرد بەهەنگوتك.

رَغَّفَ العجینَ ونحوه: بەمانا (رَغَفَهُ).

الرَّغیف: هەنگوتکە هـەویر کـە ئامـادە دەکـرێ بکـرێ بـەنان ٥ (ك: أرغفـة، رُغفان، رُغُفٌ).

رَغَـلَ أمَّـهُ رَغْـلاً ورَغْلَـةً: قومـە شیرێـکی لەدایکی دزی.

رَغِـلَ رَغَـلاً: کێـری نـەبڕاوە، سـوننەت نەکراوە.

أرْغَـلَ: کـاری خراپـی کـرد، شـتەکانی لەشوێنی خۆیان دانەنا.

أرْغَـلَ الـزرعُ: دانەوێڵەکـە پێـگەیی، دەنکەکانی رەق بوو.

أرْغَلَ فلان: فلانکەس کـاری منداڵانـەی ئەنجام دا ٥ لەکاتی تـرسو ناخۆشـی دا هانای بۆ دایکی دەبرد، یان وەکوو منـداڵ دەدوا ئەمـەش مانـای وایـە پیاوەتی تێدا نییە.

أرْغَلَـت الأمُّ المولـودَ: دایکەکـە شـیری دا بەمنداڵەکەی.

أرْغَلَ الطائرُ فَرخَهُ: باڵندەکە بژێوی بـۆ بێـچووەکانی دابـین کـردو خـۆراکی پێدان.

الأرغَـلُ: سـوننەت نـەکراو یـان (دەعبازل).

**الرُّغْلَةُ**: شیر پێدان بەلەنكاوو بێ ئاگاداری.

**الرُّغلةُ**: ئەو پێستەیە كەلەكاتی سوننەتكردن لەهێنی نێرینەی دەكەنەوە ٥ (ك: رُغلٌ).

**الرُّغول**: دەگوترێ: (شاة رَغول): كاورەو شیردەخوا ٥ (فلان رمٌّ رغول): فلانكەس هەموو شتێك كۆدەكاتەوەو دەیخوا (هەموو شتێك دەماشێتەوە) ٥ (ك: رُغُلٌ).

**رَغَمَ** رَغماً ومَرْغماً ومَرغمةً: ملكەچ بوو، بەناچاری ملكەج بوو، دەگوترێ: (رَغَمَ أنفَهُ): لوتی نایە سەر زەوی.

**أرغَمَ فلاناً**: فلانكەسی ناچار كرد، زەلیلی كرد.

**رَغِمَ** رَغماً: خۆڵاوی بوو، لەگڵی دا ٥ زەلیل كەوت ٥ بە زۆرە ملێ كاریان پێ كرد.

**أرْغَمَهُ**: بەمانا (رَغَمَهُ)دێ، دەگوترێ: (أرغم أنفَهُ).

**راغَمَ**: بەجێی هێشت، رۆیی.

**راغَمَ فلاناً**: دەنگی لەفلانكەس دابڕیو دژایەتی لەگەڵ دا كرد، دەگوترێ: (فلان لا یراغِمُ شیئاً): فلان پێویستی بەهیچ نییە.

**رَغَّمَهُ**: بەمانا (رَغَمَهُ) دێ.

**رَغَّمَ فلان أنفَهُ**: فلانكەس زەلیلو ناچار بوو.

**تَرَغَّمَ فلاناً**: كارێكی وای كرد فلانكەسی ناچار كرد.

**الـرَّاغِمُ**: بەمانا (المُـرْغَمُ) دێ، واتە ناچاركراو.

**الرَّغامُ**: گڵو خۆڵ، دەگوترێ: (ألقاه في الرَّغام): زەلیلی كردو ئیهانەی كرد، ناچاری كرد.

**الرُّغامی**: لوت ٥ بۆری هەناسە ٥ هاوسانو گەورە بوونی جگەر.

**الرُّغافَةُ**: داواكاریو پێویستی.

**الرَّغْمُ**: بەمانا (الرَّغام)دێ، دەگوترێ: (فعله علی رغمِهِ وعلی الرغم منه، وعلی رغم أنفه): واتە بەزۆرە ملێ ئەوكارەی كرد.

**الرُّغْمُ**: پێناخۆشبون، ناچاری ٥ زەلیلی، دەگوترێ: (فَعَلَهُ علی رُغمِهِ).

**المُرَاغَمُ**: پەناگاو شوێنی لێ حەوانەوە ٥ قەڵاو شوێنی خۆپاراستن.

**المَرْغَمُ**: لوت ٥ دەشگوترێ: (مالي عن ذلك مَرْغَمٌ): دەربارەی ئەوشتە هیچ دەسەڵاتێكم نییە ٥ (ك: مَراغِم).

**مَراغِم الإنسان**: واتە لوتیو دەورو بەری.

**المَرْغَمَةُ**: داواكاریو پێویستی، دەگوترێ: (لي عندك مرغمة).

**رَغَنَ** الیه رَغناً: بۆلای هاتەوە، مەیلی بۆ

کرد ٥ گوێی بۆ قسەکانی گرت‌و بەدڵی بوون.

**رَغَنَ فیه**: تەماعی لێ کرد.

**رَغَنَ فلان**: فلاّنکەس لەنازو نیعمەت دا گەورە بوو، بە ئارەزۆی خۆی لەژیانی دا خواردیو خواردیەوە، دەگوترێ: (یومُ رَغِنٍ): رۆژی خواردن‌و خواردنەوەیە ٥ رۆژی نازو نیعمەتە.

**أرْغَنَ**: فەرمانبەردار بوو.

**أرْغَنَ الیه**: بۆلای چوو، بۆی گەڕایەوە.

**أرْغَنَ فلاناً**: خواردەمەنی دا بەفلاّن.

**أرْغَنَ الأمْرَ**: کارەکەی ئاسان کرد.

**رَغَا رَغواً**: سەر توێژی گرت، سەرتوێژی لێ پەیدا بوو.

**رَغَا البعیرُ ونحوه**: حوشترەکە یان رەشە ولاّخەکە بۆڕاندی‌و ناڕەحەت بوو هاواری لێ هەڵسا، دەگوترێ: (رغا الصّبیُّ): منداڵەکە زۆر بەتوندی گریا ٥ (رغا الرعد): هەورەکە گوڵاندی، گرماندی.

**رَغَا فلان**: فلاّنکەس زۆری قسەکرد زۆر بلێ بوو.

**أرغی**: سەر توێژی بۆ پەیدابوو، یان سەر توێژی زۆر بوو، دەگوترێ: (أرغی فلان وأذبد): فلاّن رقی هەڵساو هەڕەشەی کرد ٥ هەروا دەگوترێ: (جئته فما أرغی ولا أشفی): هاتم بۆلای نەچاک‌و نەخراپ نەکەم‌و نەزۆر هیچی نەدامێ ٥ نەحوشتری دامێ نەمەڕ.

**أرغی البعیرَ**: حوشترەکەی خستە بۆڕە بۆڕ.

**أرغی فلاناً الحدیثَ**: فلاّنکەس قسەی کەم ترکرد لەو.

**رَغّی الشّیْئَ**: بەمانا (أرغی) دێ، دەگوترێ: (کلام مُرَغٍّ): قسەیەکە لێی حاڵی نابێ.

**رَغّی فلاناً**: رقی فلاّنکەسی هەڵساند.

**ارتغی الرَّغوة**: سەر توێژەکەی هەڵقوڕاند.

**تراغَوا**: هەریەکەیان لەعاست خۆیەوە بارەی لێ هەڵسا، دەگوترێ: (تراغت الرّکابُ وتراغوا علیه): سوارەکان هەریەکەیان لەعاست خۆیەوە هەرا هەرایەتی.

**الرّاغِیَة**: حوشتر، دەگوترێ: (ماله ثاغیة ولا راغیة): نەمەڕی هەیە نە حوشتر.

**الرُّغاء**: بۆڕەی حوشتر ٥ بەدەنگی گیانلەبەری تریش دەگوترێ ٥ جاری وادەبێ بۆ هەموو دەنگێك بەکاردێ، وەکوو دەڵێ: (سمعت رغاء الرعد): گوێم لەگرمەی هەور بوو.

**الرُغاوي**: ئەو توێژو دیاردەیەیە لەسەر شلەمەنی دەردەکەوێ لەکاتی کوڵاندنی دا یان لەکاتی هەژانو راوەشانی یان لەکاتی توانەوەی شت دا.

**الرُغاوة**: بەمانا (الرُغاوی) دێ.

**الرُغاء**: زۆر بلێ ٥ دەنگ گەورە ٥ دەنگ ناخۆش.

**المِرْغاةُ**: کەوگیر ٥ ئامێرێکە توێژو شتی وای لەسەر شلەمەنی پێ هەڵدەگیرێ.

**رَفَا** الثوبَ ونحوه رَفْناً ورفاءً: دڕاوی پۆشاکەکەی دوریەوەو لێکی داو چاکی کردەوە.

**رَفَا** بینهم: نێوانی باش کردن.

**رَفَا** فلاناً: فلانکەسی هێدی کردەوەو ترسو خۆفی لێ ڕەواندەوە.

**رَفَا** السفینةَ: کەشتییەکەی لەبەندەر نزیك کردەوە.

**أرفَأت السَفینةُ**: کەشتییەکە لەبەندەر نزیك بۆوە.

**أرفَأ** فلان الیه: فلانکەس مەیلی ئەوی کرد.

**أرفَأ** فلاناً: فلانکەسی هەڵخەڵەتاند، موداراتی لەگەڵ کرد.

**رَافَأهُ** مرافأةً ورفاءً: ڕەزامەندی بۆ نواند، پێی ڕازی بوو، دەگوترێ: (رافأ في البیع): لەماڵەکەدا لێبوردەیی نیشانداو ئەوازشی بۆ نواند.

**رَفَّأهُ** ترفئةً وترفیئاً: پیرۆزبایی کردو وتی: بەخۆشیو بەکوڕو کچی باش ژیان بەسەر بەرن.

**الرِّفاء**: پێکەوە هەڵکردنو بەخۆشی ژیان بەسەر بردن.

**الرِّفاءة**: پینە دۆزی پۆشاك.

**الرَّفّاءُ**: ئەوکەسەی پۆشاك پینە دەکاو چاکی دەکا.

**المرفأ**: بەندەری کەشتی ٥ (ك: مرافئ).

**اَلْیَرْفَئُ**: ترسنۆك ٥ بەندەی هەڵاتوو ٥ حوشتر ٥ ئاسك ٥ شوانی مەڕو بزن.

**اِرْفَأَنَّ**: بێ هێزو شڵو شێواو بوو، دوای تورەبوون هێواش بووەوە.

**اِرْفَأَنَّ غَضَبُهُ**: ڕقو کینەی نیشتەوەو هێواش بۆوە.

**اِرْفَأَنَّ عَیْشُهُ**: دوای کەمو کورتیو هەژاری ژیانی خۆش بوو، گوزەرانی باش بوو.

**الرُفَأْنِیَةُ**: ژیانخۆشی ٥ نازو پەروەردەیی.

**رَفَتَ رَفْتاً**: تێك شکاو وردو خاش بوو ٥ دابڕا، بڕایەوە.

**رَفَتَ فلان الشَیْئَ**: فلانکەس شتەکەی شکاندو کردی بەوردەو پردە.

**تَرَفَّتَ**: بەمانا (رَفَتَ)دێ.

الرُّفـــاتُ: ورده شــت لەهــەر جــۆره شتێـكی بـشكێ‌و ورد بكرێ‌و ببێتـه پرپۆڵه.

الرُّفـتُ: ئەوكەســەی شـت ورد دەكـاو دەیهاڕێ ٥ كای وردكراو.

رَفَـــثَ فِي كلامـــه رَفْثــاً ورُفوثـــاً: قــسەی ناشیرینی كرد.

رَفِثَ رَفَثاً: بەمانا (رَفَثَ)دێ.

رَافَثَهُ: بەقسەی ناشیرین لەگەڵی دوا.

تَرَافَثُـو: قــسەی ناشــیرینیان ناڕاسـتەی یەكتر كرد.

الرَّفَـثُ: رابـواردن‌و سـەرجێیی كردنـی پیـاو لەگـەڵ هاوسـەری خـۆی دا ٥ قورئان دەفـەرموێ: ﴿أُحِلَّ لَـكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ إِلَى نِسَآئِكُمْ﴾.

رَفَدَهُ رفداً ورفادةً: یاربوی كرد، شتێـكی دایە پێویستی خۆی پێ دابین بكـا ٥ گرتی‌و كەمەندی كرد.

رَفَــدَ فلانـــاً: یارمـــەتی فلانكەســـی دا ٥ بەخششی پێدا.

رَفَدَ الدَّابَّةَ وعليها: ژێر زین‌و ژێر كورتانی بۆ وڵاخەكه دابین كرد.

رَافَدَهُ: یارمەتی دا.

رَفَّدَ: بەشێوەی گورگه لۆقه رۆیی.

رَفَّدَ القومُ فلانـاً: گەلەكه فلانكەسیان كـردە سـەرۆك‌و گـەورەی خۆیـان‌و رێزیان لـێ گرت.

إرْتَفَدَ منه: بەشی خۆی بەركەوت.

إرْتَفَدَ مالاً: ماڵ‌و سامانی پەیدا كرد.

ترافَدُوا: یارمەتی یەكتریان دا.

استرفَدَهُ: داوای بەش‌و باری خۆی كرد ٥ یارمەتی دا.

الترفيد: دواوەی شت ٥ سمت.

الرَّافِـدُ: جێـگیری پاشا ٥ ئـەو كەسـەی لەشوێنی پاشا دادەنیشێ‌و كارەكانی جـێ بـەجێ دەكـا ٥ چـۆم ٥ روبـاری بـچوك بـچوك كـە دەچـنەوە سـەر چەمی گەورە.

الرَّافِـــدان: روبـــاری دیجلـــەو روبـــاری فورات.

الرَّافِدة: لەزانیاری هەندەسەدا بریتییه له دارێك یان چەند دارێكی بـچوك پەیكـەری باڵەخانـەو ئامێریـان لــێ پێـك دەهێنـدرێ بۆ فێربون‌و پـراوه پێكردن.

الرِّفادةُ: جسری ئـەملاو ئـەولای زیـن ٥ ئـەو خـۆراك‌و شـتەیه كـاتی خـۆی قـورەیش لـەماڵ‌و سـامانی خۆیـان كۆیـان دەكـردەوەو خواردەمـــەنی‌و ئاویـــان پـــێ دەكـــڕی بـــۆ حاجیــــه هەژارەكان ٥ ئـەو پارچـه قوماشـەیه لەژێر زینەوه لەپشتی وڵاخ دەكـرێ ٥ پارچـــه قوماشێـــكه برینـــی پـــێ دەبەسترێ.

الرِّفْــدُ: بـەش‌و بـارو قـاپ‌و قاچـاخی

گەورە وەكوو لەگەن‌و سەعەندو شتی وا ٥ قاپی شیر، مەنجەڵی شیر، دەگوترێ: (أريق رَفْدُ فلان): فلانكەس كوژرا یان مرد.

**الرِّفْدُ**: بەمانا (الرُّفْدُ) دێ ٥ بەخشش‌و عەطا ٥ یارمەتی ٥ (ك: أرفاد ورفود).

**الرِّفْدَةُ**: تاقمێك ئادەمیزاد ٥ (ك: رِفَدٌ).

**الرَّفود**: ئاژەڵی بەشیر؛ كەهەموو جارێ مەنجەڵێك پڕبكا ٥ (ك: رُفُدٌ، رفائِد).

**الرَّفیدةُ**: دەگوترێ: (هو رفیدة صدق): ئەو یارمەتیدەری راستەقینەیە ٥ (ك: رفائِدٌ).

**الرَّوافد**: داری راهێڵكراوی هەلآشی خانوو.

**المَرْفَدُ**: یارمەتی ٥ (ك: مَرافِد).

**المِرْفَدُ**: پەرداخی گەورە، یان مەنجەڵی گەورە ٥ (ك: مرافِد).

**المِرْفَدُ**: ئەو ئیسفنج‌و شتەیە ئافرەت دەیخاتە سەر سمتی بۆئەوەی سمتی قەڵەوو گەورە بنوێنن ٥ پیاڵەو پەرداخی گەورە ٥ مەنجەڵی گەورە ٥ (ك: مرافِدٌ).

**رَفْرَفَ الطائر**: باڵندەكە باڵەكانی راست كردن لێكی دان ٥ باڵەكانی خستنە جم‌و جوڵ بەدەوری شتێك دا ویستی خۆی بەسەردا بدا.

**رَفْرَفَ العَلَمُ**: ئالآكە شەكایەوە، باهێنایی‌و بردی.

**رَفْرَفَ المحمومُ**: تادارەكە هەڵ لەرزی.

**رَفْرَفَ الشَّيْءُ**: شتەكە دەنگی لێوەهات.

**رَفْرَفَ علیه**: سۆزی بۆ دەربڕین‌و خستنیە ژێر باڵی خۆیەوە.

**الرَّفراف**: باڵ ٥ بێچوە حوشتر ٥ هەروا ناوە بۆ جۆرە چۆلەكەیەك كەپەلاماری سێبەری خۆی دەدا، كەبەسەر ئاودا دەڕوا وێنەی خۆی دەبینێ پەلاماری دەدا، دەشگوترێ: (ثغرٌ رفراف): ددان‌و پوكی درەوشاوە.

**الرَّفْرَفُ**: رەفە، كەشتی نایاب‌و عەنتیكەی لەسەر ریز دەكرێ ٥ هەروا ناوە بۆ دیكۆرو كۆڕنیشی خانوو كەلەدیوار دەردەچن بەمەبەستی دور خستنەوەی تیشكی خۆر لەخانوەكە ٥ داوێنی كراس‌و زرێ‌و كەوا ٥ پەردە ٥ راخەر ٥ پشتی، كەشانی لەسەر دادەنرێ، دەشكوترێ: (ثوب رفرف): قوماشی تەنك.

**الرَّفْرَفَةُ**: تاكی (الرفرف)ە، واتە: كورسی قەنەفە، دەگوترێ: (أقعدني علی رفرفة بین یدیه).

**رَفَسَ** رَفْساً ورفاساً: بەقاچ رایکرد، قاچی لیّ دا ٥ قاچی تیّوەژەنی.
**رَفَسَ** فلاناً رَفْساً ورُفوساً: بەقاچ لەسنگی دا، قاچی لەسنگیەوە ژەنی.
**رَفَسَ** الدّابّةَ: ولاّخەکەی بە حەبلی بەلەمەکەوە بەستەوە.
**رَفَسَ** الشّیْئَ: شتەکەی کوتا، وردی کرد.
**الرِّفاس**: حەبلیّکە دەکریّتە باریکایی پشتی سمتی ولاّخەوەو بەئەژنۆیەوە دەبەستریّ.
**الرَّفاسُ**: دۆلاّبی کەشتی ٥ بەلەمیّک بەمەکینە بڕۆیەندریّ.
**الرَّفُوسُ**: ولاّخیّک قاچی پیّشەوەی هەلّنیّ.
**المِرْفَسُ**: ئامیّری شت کوتان وەکوو کوتکی ساوەر کوتان‌و ئەو جۆرە شتانە ٥ (ك: مرافِس).
**رَفَشَ** في الأمر رُفوشاً: بەرفراوان بوو، کارەکە تەنیەوە.
**رَفَشَ** الحُبوبَ رَفْشاً: دانەویّلەکەی تیّک هەلّداو هەلّی ڕشت.
**رَفَشَ** الطعامَ: بەرپیّك‌و پیّکی خواردنەکەی خوارد.
**رَفَشَ** الشّیْئَ: شتەکەی وردکردو کردیە شۆرباو.
**رَفِشَ** رَفشاً: گویّچکەکانی زل‌و پان بوون (گویّپان) ٥ (هو أرفش وهي رفشاء).
**أرْفَشَ**: کەوتە خواردن ٥ دەست پیّکردن.
**أرْفَشَ** بالمکان: لەو شویّنە مایەوەو لیّی نەجولاّ.
**رَفَّشَ** لحیتَهُ: ریشی بەردایەوە تا بەقەد دەمەبیّلّیّك پان‌و دریّژ بوو.
**الرَّفْشُ**: خواردنی چاك‌و خواردنەوە لەشویّنی خۆش‌و ئەمین دا، دەگوتریّ: (وقع في الرِّفش والقَفْشِ): کەوتە ناو نازو نیعمەتەوە، خواردنی چاك‌و ژنی جوان ٥ هەروا ناوە بۆ ئەو ئامیّرە خاکەناز ئاسایەی دانەویّلّەی پیّ رادەدریّ، دەگوتریّ: (من الرِّفش الی العرش): ئەو پیاوە لەکریّکاری گەنم‌و جۆ ڕادانەوە بۆسەر کورسی پاشایی.
**الرَّفّاشُ**: ئەو کریّکارەی بەبیّل‌و خاکەناز دانەویّلّەی پیّ ڕادەدریّ.
**ارْتَفَص** السعرُ: نرخ بەرز بۆوە، هەروا دەگوتریّ: (ارتفصت السوق): بازاڕ بەرزبۆوە.
**ترافصوا** الماءَ وغَیْرَهُ وعلیه: بە نۆرە چوونە سەر ئاوەکە.
**الرُّفْصَةُ**: هەل، نۆرە، بریتییە لەو برە کاتەی کەبەر یەکیّك دەکەویّ بۆ چونە سەر ئاویّك کە هاوبەشە لەنیّوان خەلّکەکەدا ٥ خودی ئاوەکەیە کەهاوبەشە لەنیّوان خەلّکەکەدا.
**الرَّفیصُ**: ئەوەی زۆر ئاو خۆرەومیە.

**رَفَضَ الوادي رَفضاً ورفوضاً**: شێوو دۆڵەکە بەرفراون بوو.

**رَفَضَ النَخلُ**: دارخورماکە لقەکانی بڵاو بوونەوەو پەردەکەی لەخۆ دارنی.

**رَفَضَت الماشِيَةُ**: ئاژەڵەکان لەپاوانەکەدا بڵاو بوونەوەو هەریەکەیان لەشوێنێك دەلەوەڕێ.

**رَفَضَ الشَيْءَ رفضاً**: وازی لەشتەکە هێناو خۆی لێ پاراست ٥ رەمی لێ کردو دەری کرد ٥ شکاندیو فڕێی دا.

**رَفَضَ الماشِيَةَ**: ئاژەڵەکانی لەلەوەڕگاکەدا بەرەڵاکردن بۆخۆیان بەئارەزۆی خۆیان بلەوەڕێن.

**رَفَضَ في القربة ونحوها**: هەندێکی ئاو لەکوندەکە دا هێشتەوە.

**تَرَفَّضَ**: لێك ترازاو بڵاو بۆوەو نەما ٥ پرژاو بوو بەتەپو تۆز.

**ارْفَضَّ**: بەمانا (تـرفّضَ)دێ، دەگوترێ: (إرفَضَّ الدمعُ) و(ارفَضَّ العَرَق): فرمێسکەکانی بڵاو بونەوە، عەرەقی سڕایەوەو نەما ٥ (إرفَضَّ الوَجَعُ): ئازارەکە نەما.

**استرفَضَ الوادي**: بەمانا (رَفَضَ) دێ.

**الرَافِضَةُ**: مێینەی (الرافض) ٥ کۆمەڵێك سەرباز کەلە بەر پرسەکەیان هەڵبگەڕێنەوەو لەچۆن بۆ شەڕبگەڕێنەوە ٥ تاقمێکی شیعە مەزهەبن بەلایانەوە وایە تانە لەهاوەڵانی پێغەمبەر بدرێ، بۆیە ئەو ناوەیان لێ نراوە چونکە کاتێك تاقمەکەیان سەرەتا تانەیان لە خەلیفەی یەکەمو دووەم داو زەیدی کوڕی عەلی نەی لێ کردن ئەوان رەفضیان کردو لەزەید هەڵگەڕانەوە.

**الرَافِضِيّ**: ئەوکەسەیە ڕێبازی رافیزیان دەگرێو ڕێگە بەخۆی دەدا جنێو بەهاوەڵانی پێغەمبەر بدا.

**الرُفاض من الشَيْء**: ئەوەی لەشتەکە دەکەوێتە خوارو بڵاو دەبێتەوە.

**الرِّفاضُ**: ڕێبازی جۆراو جۆرو تولە ڕێگای راستو چەپ.

**الرُّفْضُ**: شلەمەنی کەم ٥ بژێو.

**الرُّفَضُ**: شتی بڵاوە بوو پرژاو لەهەرجۆرێك بێ ٥ تاقمێك لەئادەمیزاد ٥ کەمێك لەشلەمەنی کەلەبنکی قاپ دا بمێنێتەوە ٥ بژێو ٥ (ك: رفوض ورِفاض وأرْفاض).

**رفوض الأرض**: ئەو شوێنانەی زەوی کەناکرێنە مڵك.

**الرِّفْضُ**: بیرو باوەڕی رافیزە.

**الرُّفَضَةُ**: ئەوکەسەی رەفزی زۆر شت دەکاو بەهیچ رازی نابێ، دەگوترێ: (هو قُبَضَةٌ رُفَضَةٌ): شت هەڵدەگرێو

وازی لێ دێنێ ٥ (راع قبضة رُفضَةٌ): شوانێکه ئاژەڵەکان دەهاژوێ بۆ پاوان‌و چاودێرییان دەکاو ئەمجا لێیان دەگەرێ بۆخۆیان بەویستی خۆیان بلەوەرێن.

الرُّفاضُ: ئەوکەسەیە چاودێری ئەو شوێنانە دەکا کەناکرێنە موڵك.

الرُّفيض: عەرەقی لەش ٥ شوتی شکاو پکاو.

المَرْفِضُ: رێرەوی ئاو، شوێنی هاتنە خوارەوەی ئاو (پلوسك).

رَفَعَ القومُ رَفعاً: خەڵکەکە بەکێوەکەدا هەڵکەرا.

رَفَعَ البعيرُ: حوشترەکە خێرا رۆیی‌و پەلەی کرد.

رَفَعَ الشَّيْءَ: شتەکەی بەرزکردەوە بۆسەرەوە ٥ گواستیەوە ٥

رَفَعَ البناءَ: باڵەخانەکەی بەرز کردەوە، چین چین دیوارەکانی خستە سەریەك.

رَفَعَ يَدَهُ عن الشَّيْ: دەستی لەشتەکە هەڵگرت.

رَفَعَ فلاناً: ناوی فلانی بەرزکردەوە، رێزو حورمەتی بۆ زیاد کرد ٥ ناوی هێنا بەباشە، دەشکوترێ: (هذا أمر يرفع الرأس): ئەمە کارێکە سەربەرزی دەستە بەر دەکا، دەبێتە هۆکاری شکۆمەندی.

رَفَعَ اللهُ عَمَلَهُ: خودا خێرەکەی لێ وەرگرت.

رَفَعَ الشَّيْءَ في خزانته: شتەکەی لەناو قاسەکەی دا هەڵگرت.

رَفَعَ ذات اللبن لَبَنَها: شیردەرەکە شیرەکەی گرتەوەو نەیدا.

رَفَعَ فلاناً الى الحاكم رفعاً ورفعاناً: فلانکەسی خستە بەردەم دادوەر بۆئەوەی دادگایی بکا، دەشکوترێ: (رفع الى السلطان رفيعة): هەندێ روداوی تایبەتی خۆی پێشکەش بەپاشا کرد.

رَفَعَ اليهم عيونَهم: سەیریان کرد ٥ دەگوترێ: (دخلتُ على فلان فلم يرفع لي رأساً): چومە لای فلان‌و هەرسەری بەرز نەکردەوە سەیرم بکا، روی تێ نەکردم.

رَفَعَ فلان الى أصله: فلانکەسی بردەوە سەر رەگەزی خۆی.

رَفَعَ الحديث الى قائله: قسەکەی بە زنجیرە بردەوە سەر بێژەرەکەی بۆیە حەدیثی مەرفوع ئەوەیە بەزنجیرە بگاتە سەر پێغەمبەر (د.خ).

رَفَعَ الخَبَرَ: هەواڵەکەی بڵاو کردەوە.

رَفَعَ البَعيرَ: حوشترەکەی تاودا بۆئەوەی خێرا بڕوا.

**رَفَـــعَ الكلمـــةَ:** وشـەکەی بەمـــەرفوع خوێندەوە واتە کۆتاییەکە نیشانەی رەفعەی خستە سەر.

**رَفَـعَ العقوبـة أو الـضربة:** سـزاکە یـان زەربیەکـەی هەڵـگرت، دەشـگوترێ: (فـلان مرفــوع عنـه التکلیــف): فلانکـەس ئـەرکی لەسـەر نییـە، بەرپرسیار نییە.

**رَفُعَ رفاعَة:** دەنگی گەورە بوو.

**رَفُـعَ الثـوبُ أو الخيطُ:** قوماشـەکە تـەنك بوو، دەزوەکە باریك بوو.

**رَفُـعَ فـلانٌ:** فلانکەس پلەو پایەی بـەرز بـۆوە، دەگـوترێ: (رَفُـعَ في حـسبه ونسبه).

**رافَعَهُ:** بەمانا (رفَعَهُ) دێ.

**رافَــعَ إلى الحــاکم وغـيره:** ئیـشەکەی گەیاندە دادوەرو شکایەتی لـێ کرد.

**رَفَّــعَ:** بـازی هاویــشتن هەندێــکیان درێژتر بوون.

**رَفَّـعَ الـشَّيْءَ:** شـتەکەی پێـشکەش کـرد پێشی خست.

**اِرْتَفَـــعَ:** بـــەرز بـــۆوە ٥ پێـــشکەوت ٥ گواستیەوە، لاچو نەما.

**رَفَّعَ الشَّيْءَ:** شتەکەی بەرزکردەوە.

**ترافعا الى الحاکم:** کێشەکەیان بردە لای دادوەر.

**ترافع المحامي عن المتهم أمام القضاء:** پارێزەر لەبەردەم دادگادا داکۆکی له تۆمـەتبار کـرد بەڵـگەی بـەهێزی خـــستنە ڕو لەســـەر بێتـــاوانی تۆمەتبار.

**تَرَفَّــعَ:** بــەمانا (ارتَفَـــعَ) دێ ٥ پـاكو بێــگەردە، لەخـــوشو لەککــەداری دووره.

**تَرَفَّعَ الشَّيْءَ:** بەمانا (رفَعَهُ) دێ.

**استرفَعَ الـشَّيْءُ:** شـتەکە کاتی لابردنـی هات.

**استرفَعَ الشَّيْءَ:** داوای لابردنی شتەکەی کرد.

**الإرتفــاع:** لــەزاراوەی ئەنــدازیاریی دا بریتییــە لــە درێــژی پایــەو شـتی بەرزەوە بوو.

**الرّافِــع:** ناوێــکە لــەناوە جوانــەکانی خـودا، دەشـگوترێ: (بـرق رافِـع): بروســکەیەکی شــوعلەدار، (ناقـــة رافِـــع): حوشترێـــکە شـــیرەکەی گرتۆتەوەو شیر نادا.

**الرّافِعَة:** هەر کۆمەڵو تاقمێك هەواڵو نهێنـی بـلاو بکەنـەوە ٥ ئامێرێــکە شـت بەرزدەکاتـەوە، شـتی پـێ بـەرز دەکرێتەوە.

**الرِّفاعُ:** گواستنەوەی کرشـەی کـشتوکاڵ بۆسـەر خـەرمان بـۆ گێرەکـردنو شـەنکردنو پـاککردن، دەگـوترێ: (هذه أيام رِفاع).

**الرُّفَاعَــةُ:** تونـدی دەنــگو بــەرزیو

کاریگەری لەسەر گوێچکە، دەگوترێ: (في صوته رُفاعة).

الرَّفْعُ: لەزاراوەی نەحودا ضەمەیە (بۆرە) یان ئەو پیتەی لەشوێنی ئەو دێ ٥ هەروا بەدەست هەڵگرتن لەخواردنو خواردنیش دەگوترێ پێش کازیوە بۆکەسێك بەرۆژو بێ.

الرِّفْعَةُ: رێزو پلەو پایەو شکۆمەندی.

الرفیعة: ئەو شتەی بەهۆی پێشنیارو راپۆرتەوە بەرز دەکرێتەوە بۆلای دادوەر، دەگوترێ: (وَقَعَ في الرفیعة کذا).

المُرَافَعَة: هەڵسو کەوتو چەندو چونێکە بەرچاو دەگیرێ بۆ راستکردنەوەی داواو پێوە رۆیشتنی کەوا بوو (قانون المرافَعات): ئەو یاسایەیە هەڵسو کەوتو چۆنیەتی بەرێوە بردنی داواکەرێك دەخاتە بەردەم دادگا.

المِرْفاع: ئامێرێکە بۆ بەرزکردنەوەی قورسایی وەکوو (جەگ).

المَرْفَعُ: کورسی ٥ (ك: مَرَافِع) ٥ وشەی (مَرَافِع): لای مەسیحیەکان چەند رۆژێکی دیارن پێش رۆژانی رۆژو گرتن دەکەون.

المِرْفَعُ: ئامێری بەرزکردنەوە.

المرفوع: لەحەدیثی پێغەمبەردا (د.خ) ئەومیە پاڵ پێغەمبەر دەدرێ، جا قسە بێ یان کردەوە بێ یان رازی بون بێ.

رَفِغَ رَفْغاً: شوێنی پیسایی ناو جەستەی فراوان بوون گەدەی کشا ٥ دیوی ناوەوەی گۆشتی ئازاری پەیدا کرد ٥ (هو أرْفَغُ وهي رَفغاء).

رَفُغَ العیشُ رَفَاغَةً: ژیانی خۆش بوو.

أرْفَغَ: ژیانی خۆش بوو، گوزەرانی باش بۆ گونجا.

أرْفَغَ له العَیْشَ: ژیانی بۆخۆشکرد.

تَرَفَّغَ: گوزەرانی خۆش بوو.

الأرفغُ من العیش: ژیانی خۆشو بەپیتو گوزەرانی خۆش.

الرِّفاغَةُ: گوزەرانخۆش.

الرِّفاغِیَةُ: بەمانا (الرِّفاغة)دێ.

الرَّفَغُ: نەرمو نیانیو ئاسانکاریی ٥ ژیانخۆشیو گوزەرانی گونجاو ٥ شوێنی بەپیتو بەرەکەت ٥ گرانیو قاتو قڕی ٥ هەرشوێنێك لەجەستە چڵكو پیسایی تێدا کۆبێتەوە ٥ خوێریو هەتیو مچە.

الرُّفْغُ: هەرشوێنێکی جەستە، چڵکی تێدا کۆببێتەوە.

الرُّفَغْنِیَةُ: ژیانخۆشیو هەرزانی.

الْمَرَافِغُ: بن باڵو شانو شەپیلكو کۆتایی ڕان.

رَفَّ رفّاً وَرَفِيفاً وَرَفَّةً: باڵندەکە قونەی کرد، باڵی فش کردن بۆ هەڵفڕین ٥ (رفّت العين او الحاجب): چاوی فڕی یان برۆی فڕیو پەلەی کرد.

رَفّت النباتُ: گیاو گژەکە لەتێر ناویو تەڕدەماخی دا شنە شنی بوو.

رَفَّ البَرْقُ: بروسکەکە روناکایی داو شوعلە بەخش بوو.

رَفَّ فلان رَفّاً: فلانکەس زۆری خوارد.

رَفَّ له وإليه: کەروێشکەی کردو شنایەوە، دەگوترێ: (رَفَّ فؤادي لحديثه): دڵم بەوتەکانی گەشایەوەو شنایەوە.

رَفَّ القومُ بـه: خەڵکەکە دەوریان داو لێی کۆبونەوە.

رَفَّ عليه النعمةَ او السعادة: نازو نیعمەتی بەسەردا ڕشت ٥ بەختەوەری کرد.

رَفَّ له: کردو کۆششی بۆکرد بەچاکە یان بەخراپە.

رَفَّ فلاناً: بەخششی دا بەفلانو شتی خۆشی دەرخوارد دا ٥ چاکەی لەگەڵ کردو ڕێزی لێ گرت، دەگوترێ: (ذهَبَ من يحفُّهُ وَيَرُفُّهُ): رۆیی ئەوەی خزمەتی دەکردو پێداویستی ژیانی خۆشی بۆدابینکردو سۆزی بۆ دەنواند.

رَفَّ البَقْلَ ونحوه: گیایەکەی خوارد بەلام پاروی پڕبەدەمی نەگرت.

رَفَّ الطعامَ: زۆری خوارد.

رَفَّت الأمُ: دایکەکە شیری دا بەزارۆکەکەی.

رَفَّ اللبَنَ: هەموو رۆژێ شیری خواردەوە.

رَفَّ الشَّيْءَ: شتەکەی مژیو هەڵی لوشی، دەگوترێ: (رَفَّ المرأةَ أو شَفَتَيْها): ئافرەتەکەی ماچ کرد لێوی مژی.

رَفَّ الدَّابَّةَ: کای دا بەوڵاخەکە.

رَفَّ البيتَ: تاقو رەفەی بۆ خانوەکە دروست کرد.

رَفَّ الثوبَ: قوماشی تری خستە سەرپانایی کراسەکە بۆئەوەی لەلای خوارەوەی پانتربێ.

أرَفَّت الدّجاجةُ ونحوها على بيضها: مریشکە باڵی خۆی بەسەر هێلکەکانی دا فش کردنەوە کڕ لەسەریان هەڵنیشت.

إرتَفَّ: بەمانا (رَفَّ يرِفُّ) دێ، دەگوترێ: (إرتفّ النَّباتُ وإرتفَّ البرقُ).

الرُفافُ: ئەو وردەو تەپو تۆزەی لەکا هەڵدەوەرێ.

الرُفافَةُ: ئەو شتەی لەخوار کەللە سەرەوە دەبەسترێ.

الرَّفُّ: وەکوو تاقەوایە لەدیوار دا، شتی نایابی ناو ماڵی لەسەر دادەنرێ ٥ یان تەختە دارێکە بەپاڵ دیوارەوە

دادەنرێ قاپو قاچاغ یان کتێبو دەفتەرو شتی وای دەخرێتە سەر، دەگوترێ: (وَضَعَ الكتبَ على الرَّفِ): کتێبەکانی لەسەر ڕەفەکە داناون ◦ تاقمێك مەلو باڵندەن ◦ کراسی نەرمو نیانە ◦ ئاوی زارە کە دەدرەوشێتەوەو هەڵدەملیسرێ.

**الرُّفُ:** کا ◦ وردە کاو کوت.

**الرُّفاف:** شتێك زۆر بدرەوشێتەوە، دەگوترێ: (ثغر رَفّافٌ): پوكو ددانێکی درەوشاوەن ◦ (روضة رفّافة): باخێکە پرشنگدارە.

**الرِّفَةُ:** قومە ئاوێك ◦ خواردنێکی باشو ڕێكو پێك ◦ چاوفرین، برۆ فرین، دەگوترێ: (هو يتفاءلُ من رفة عينه اليمنى ويتشاءَمُ من رفة اليسرى).

**الرُّفَّةُ:** بەمانا (الرُّفّ) دێ.

**الرّفيف:** بریسکەو پرشنگ، دەگوترێ: (لثغرها رفيف) ◦ هەروا ناوە بۆ پۆشاکی تەنك ◦ درەختێك لقو پۆپەکانی شۆڕابەیان کردبێ ◦ زەوی بەپیتو بەرەکەت ◦ هەلاشی ڕەشماڵ یان ئەو پرژو پەتکانەی لێیەوە شۆڕبونەوە ◦ (ذات الرفيف): ئەو باغچەو روەكو درەختەی لەبەر تێرئاویو تەڕدەماخی بریسکەو ورشەی لێوەبێ ◦ هەروا ناوە بۆ ئەو بەلەمو کەڵەکانەی لەناو روباردا ڕیزدەکرێن بۆ ئەوەی خەڵك بەسەریان دا بپەڕێتەوە.

**رَفَقَ** به وله وعليه رِفقاً ومرفِقاً: نەرمو نیان بوو لەگەڵی دا هەڵسو کەوتی جوانی لەگەڵ دا کرد.

**رَفَقَ في السير:** لەرۆیشتن دا هێدیو لەسەرە خۆ بوو.

**رَفَقَ فلاناً:** لەئانیشکی فلانی دا.

**رَفَقَ البعيرَ:** بە گوریس دەستی حوشترەکەی بەست.

**رَفُقَ فلان رفاقَةً:** بوو بەهاوڕێو برادەر، دەگوترێ: (كنت في رفاقة فلان): لەگەڵ فلانكەس بووم.

**أرفَقَهُ:** لەگەڵی دا هێدیو هێمن بوو ◦ سودی پێ گەیاند.

**رَافَقَهُ مُرافَقَةً ورِفاقاً:** بۆ بەهاوەڵو هاوڕێی، دەگوترێ: (رافَقَهُ في السفر، ورافقته السلامة).

**إرتَفَقَ:** سود بەخش بوو، داوای یارمەتی کرد.

**إرتَفَقَ عليه:** شانی لەسەر دادا ◦ ئانیشکی دادا، دەگوترێ: (بتُّ مُرتَفِقاً): شەوم بەڕۆژ کردەوە ئانیشکم دادابوو.

**إرتَفَقَ القومُ:** خەڵکە بوون بەهاوڕێی یەکتری.

**ترافَقَـا**: بـوون بـەدوو هـاوەڵ ○ بـوون بەهاوڕێی یەکتر.

**تَرَفَّقَ به**: بەمانا (رَفَقَ)دێ.

**تَرَفَّـقَ عليـه**: پـشتی پێـوەدا ئانیـشکی لەسەر دادا.

**تَرَفَّقَ به**: سودی گەیاند، داوای کۆمەکی کرد.

**اسـترفَقَهُ**: داوای کـرد ببێتـە هـاوڕێی، دەگوترێ: (استرفَقْتُهُ فارفقني).

**الأرفَقُ**: دەگوترێ: (هذا الأمر أرفق بـك وعليـك): ئـەو کـارە بـۆ تـۆ سـود بەخشە.

**الرافِقُ**: سود بەخش.

**الرافِقَةُ**: هێدیو هێمن.

**الرِّفاقُ**: حەبلێکە دەستی حوشتری پـێ دەبەسترێ، کاتی ترسی ئـەوەی لـێ کرا بەلەسەببێ.

**الرُّفاقَـةُ**: کۆمـەڵی هاوڕێیـانو دۆسـتو برادەر.

**الرِّفْـقُ**: بەیدەسـتو خـۆش لەمـست، دەگوترێ: (مـاءٌ رَفْـقٌ ومرتَـعٌ رفـقٌ): ئاوێـکە بەخۆشـی دەسـتی دەگاتـێ لەوەرگایەکە بەئاسانی پێ دەگەی.

**الرُّفْقَةُ**: هاوڕێیەتی.

**الرَّفيقُ**: بەسۆزو نەرمو نیانو لەسـەرە خـــۆ ○ بەوکەســـەش دەگـــوترێ کەلەتەك فەرمانڕەواو پاشادایەو بۆ هـەموو شوێنێـك لەخزمـەتی دا دەبـێ ○ سـود بـەخش ○ ژن، مێـرد، هاوسەر.

**الرفيقة**: مێینەی (الرفيق)ە ○ ژن.

**المُرافِق**: هاودەمو هەمئاهەنگی مەلیكو پاشا.

**المُرتَفَقُ**: دامو دەزگای خزمەتگوزاریی.

**المَرْفِــــقُ**: ئـــەو دامو دەزگایانــــەی خزمـەتگوزاری پێـشکەشی کۆمەڵـگا دەکەن، وەکوو دائیرەی ئاوو ئـاوەڕۆو کارەباو خەستەخانە.. ○ هەرشتێـك لەســـــەری دابنیــــشیو پــــاڵی لەسەربدەیەوە ○ ئانیشك؛ جومگـەی نێوان دەستو قۆڵ.

**المِرْفَقُ**: بەمانا (المَرفِقُ) دێ، (مِرْفق الـدار ونحوها): ئەو شتانەی لەگەڵ خـانوو حیـساب دەکـرێن، وەکـوو حـەمامو مەتبـــەخو بـــەربێلاو حەوشـــەو تەنکیو بیری ئاو.

**المِرْفَقَـــةُ**: ئەوشـــتەی لەســـەری پـــاڵ دەدەیـــەوە ○ دۆشـــەكو ســـەرینو کورسیو کەرەوێتە.

**رَفَــلَ رَفْــلاً ورفلانــاً**: لەرۆیـشتن دا لارو لەنجەی کردو داوێنی خـۆی لـەزەوی خشاندو بەدوخۆیدا رایکێشا.

**رَفَلَ ثوبَهُ**: کراسەکەی درێژکردو بەدوخۆی خشاندی.

**رَفَلَ البِئرَ**: بیرەکەی لیّلّو قوڕاو کرد.

**أرفَلَ**: بەمانا (رَفَلَ)دێ، دەگوترێ: (أرْفَلَ في ثيابه): لەناو پۆشاکەکەدا لارو لەنجەی کرد.

**أرفَلَ ثوبَهُ أو ازاره أو ذيله**: کراسەکەی یان دەرپێیەکەی یان لکی مێزەرەکەی درێژ کردو شلی کردو بەدوخۆیدا خشاندی.

**أرفَلَ القومُ فلاناً**: گەلەکە فلاّنیان کردە گەورەو پاشای خۆیان.

**رَفَّلَ**: دەگوترێ: (رَفَّلَ في ثيابه): بە پۆشاکەکەیەوە لارو لەنجەی کرد واتە: دەق بەمانا (رَفَلَ)دێ.

**أرفَلَ ثوبَهُ او إزارَه أو ذيلَه**: کراسەکەی یان دەرپێیەکەی یان لکی مێزەرەکەی درێژکردو بەدوخۆی دا دا لەعەرزی خشاند.

**أرفَلَ الملكُ فلاناً**: پاشا فلاّنکەسی کردە حاکمو لێپرسراو.

**تَرَفَّلَ فلان ترفّلاً**: بەمانا (رَفَلَ)دێ.

**ترفَّلَ**: بەمانا (رَفَلَ)دێ.

**ترفّلَ عليهم**: بوو بەحاکمو فەرمانڕەوا بەسەریانەوە.

**الترفيلُ**: لەزانستی عوروزدا زیادکردنێکی سەبەبە لەسەرەوای شیعرەکەدا، وەکوو زیادکردنی (تُنْ) لەسەر (متفاعِلن)و بگوترێ: (متفاعلاتن).

**الرِّفالُ**: درێژ، دەگوترێ: (شَعرٌ رفال وثوب رفال).

**الرِّفَلُ**: کلکی درێژ ◦ پۆشاکی درێژ ◦ پۆشاکی فشو فۆلّ ◦ زیانی خۆش ◦ ئافرەتی گۆشتن.

**المِرْفالُ**: کەسێك زۆر لارو لەنجە بکا، دەگوترێ: (رجل مِرفال وامرأة مرفال) ◦ (ك: مرافيل).

**المِرْفَلَةُ**: بەرمورو خشلّو ملوانکەی درێژ، کە ئافرەت لارو لەنجەی پێوە بکا ◦ (ك: مرافِل).

**رَفَهَ رفهاً ورفوهاً**: نازو نیعمەتی باشو بەرفراوانی توش هات.

**رفَّهَ فلاناً وبه**: بەزەیی بەفلاّنکەس دا هاتەوە، سۆزی بۆی بوو.

**رَفُهَ رَفاهَةً ورُفاهيةً**: بەمانا (رَفَهَ) دێ.

**أرْفَهَ**: بەمانا (رَفَهَ) دێ، دەگوترێ: (أرْفَهَ فلان): لەخواردنو خواردنەوەو پۆشاك لەبەرکردن دا زێدە ڕۆیی کرد ◦ خۆشی ڕابواردو ئیسراحەتی کرد ◦ هەروا دەگوترێ: (أرفِهْ عندي): لای من بمێنەوەو ئیسراحەت بکە.

**أرْفَهَ**: سەری بەشانەکردو ڕۆنی لێ دا.

**أرْفَهَ فلاناً**: فلاّن کەسی خستە ناو نازو نیعمەتەوە.

رَفَّهَ: بەمانا (أرْفَهَ).
رَفَّهَ نَفْسَهُ: نازو نیعمەتی بۆ نەفسی خۆی دابین کرد، دەگوترێ: (رفِّهْ عندي): لای من بمێنەوەو خۆش رابوێرە.
رَفَّهَ عنه: ناخۆشی دورخستەوەو ژیانی خۆشی پڕنازو نیعمەتی بۆ دەستە بەرکرد.
رَفَّهَ علیه: مۆڵەتی دا.
تَرَفَّهَ: بەمانا (رَفَهَ)دێ.
استَرْفَهَ: بەمانا ((تَرَفَّهَ)دێ، دەگوترێ: (اسْتَرْفِهْ عندي) بەمانا (أرفِهْ عندي)دێ.
الرَّفاهَةُ: ژیانی خۆش‌و پڕنازو نیعمەت‌و هەرزانی.
الرَّفاهِیة: بەمانا (الرَّفاهَة)دێ.
الرَّفَهَةُ: سۆزو خۆشەویستی‌و بەزەیی.
الرُّفَهْنِیَةُ: بەمانا (الرَّفاهةُ) دێ، دەگوترێ: (هو في الرُّفَهْنِیَةِ من العیش).
رفأ رَفْواً: ژنی هێنا ◦ هاوسەرگیریی کرد.
رفأ الثوب ونحوه من کل منسوج: پۆشاکەکەی پینەکرد، دوریپەوە، هەندێکی بەهەندێکی ترەوە نووساند، دەگوترێ: (رفأ الخرق): کونەکەی پڕکردەوەو چاکی کردەوە.
رفأ فلاناً: ترس‌و بیمی لەسەر فلانکەس لابرد.
أرفَت السفینةُ: کەشتیەکە لەبەندەر نزیك بۆوە.
أرفأ الیه: پەنای بۆ برد، چووە پاڵی.
أرفأ السفینة: کەشتیەکەی نزیك بەندەر کردەوە ◦ یان لەزەوی نزیك خستەوە.
أرفأ فلاناً: موداراتی لەگەڵ دا کرد.
رافأهُ مرافأةً: هاوڕای بوو، چووە سەر بیرو باوەڕی ئەو ◦ زەمانە سازی لەگەڵ دا کرد.
رَفَّى المتزوِّجَ: پیرۆزبایی لەو کەسەکرد کەژنی هێناوە پێی وت پیرۆزباییت لێدەکەم هیوادارم کوڕو کچی زۆرتان ببن.
ترافَؤا علی الأمر: کارەکەیان پەسەند کرد، بەلایانەوە باش بوو.
الرِّفاءُ: پیرۆزبایی کردنە لەو کەسەی هاوسەرگیری کردووە.
الرُّفَةُ: کاو پڵوپوش.
الرَّفّاءُ: ئەوکەسەی پیشەی پینەسازی جل‌و بەرگ بێ ◦ بۆ ئافرەت دەگوترێ: (رفّاءة).
رَقَأ الدَّمْعُ والدَّمُ ونحوهما رَقْأً ورُقُوءاً: فرمێسکەکە یان خوێنەکە گیرسایەوەو وشك بۆوە.
رَقَأ دمُ القاتل: بکوژەکە خوێنی بۆدرا، خوێنی دا، خوێنبەستی کرد.

**رَفَا** بينهم: ئاشتەوایی لەنێوان دا کردن ◦ رێکی خستنەوە، دەگوترێ: (ارْفَأْ علی ظِلْعِك): بەزەییت بەخۆتا بێ ◦ بەئەندازەی بەرەی خۆت قاچ راکێشە، هەروا دەگوترێ: (لا أرفأ الله دمعتَهُ): خودا فرمێسکت وشك نەکاتەوە.

**الرُفوءُ**: بەوکەسە دەگوترێ صوڵحی نێوان خەڵك دەکا ◦ ئاشتەوایی دەخاتە نێوان خەڵکەوە، دەگوترێ: (الدِّيَةُ رفوء الدم): خوێن دان بەکەس‌و کاری کوژراو خوێنی بکوژ دەپارێزێ‌و لەکوشتنەوە ڕزگاری دەکات.

**رَقَبَهُ رَقْباً ورُقوباً**: چاوەڕوانی کرد ◦ سەرنجی ڕاکێشا ◦ پارێزگاری کرد.

**رَقَبَ فلاناً**: لەملی فلانی دا ◦ پەتی لەملی فلانکەس کرد.

**رَقِبَ رَقَباً**: ملی ئەستور بوو ◦ (هو أرْقَبُ وهي رَقْباءُ).

**أرقَبَهُ داراً أو أرضاً**: خانوەکە یان زەوییەکەی کردە مڵك‌و سامان بۆ خۆی‌و بۆنەوەکانی.

**راقَبَهُ**: چاودێری کرد ◦ لێی ترسا، دەگوترێ: (فلان لا يراقب الله في أمره).

**إرْتَقَبَ**: بەرزبووە، ڕێزدار بوو.

**إرْتَقَبَ الشَّيْئَ**: چاوەڕوانی شتەکەی کرد.

**تَرَقَّبَهُ**: چاوەڕوانی کرد.

**الرُّقابَةُ**: چاودێری کردن ◦ سانسورکردن لەسەر کتێب‌و نوسراوی تر پێش لەچاپدان‌و بڵاوکردنەوەیان ◦ یان دەست تێوەردانی حکومەت یان بانکی مەرکەزی بۆ ئەوەی کار بکاتە سەر نرخ‌و بەهای جۆرە پارەیەك.

**الرُّقبى**: ئەوەیە یەکێك بەیەکێ تر بڵێ ئەگەر من پێش تۆ مردم فلان خانوو یان فلان زەویم بۆ تۆ بێ، ئەوی تریش بەویان وابڵێ، هەریەکەیان چاوەڕێی مردنی ئەوی تربێ.

**الرُّقْبَةُ**: چاڵێکە هەڵدەکەندرێ بۆ گرتنی پڵینگ.

**الرَّقَبَةُ**: ئەستۆ، مل ◦ بەهەموو جەستەی ئادەمیزادیش دەگوترێ ◦ هەروا ناوە بۆ کۆیلەو بەندەو کەنیزەك ◦ هەروا ناوە بۆ بەشی ژوروی کەمان.

**الرِّقابَةُ**: حەرەسی کاڵاو چاودێری شت‌و مەك.

**الرُّقوبُ**: ئەو دایك‌و باوکەی منداڵیان بۆ نامێنێ ◦ کەسێك (پیاو بێ یا ژن) نەتوانێ کاربکاو بزێوو

پێداویستی خۆی دابین بکا ٥ هەروا بەژنێك دەگوترێ چاوەڕوانی مردنی مێردەکەی بکا بۆئەوەی میراتی لێ بگرێ یان شوبکاتەوە بەیەکێکی تر ٥ (أم الرقوب): بەڵاو کارەسات.

الرَّقِیب: ناوێکە لەناوە جوانەکانی خودا ٥ چاودێرو حەرەس ٥ پێشەتای سوپا ٥ کەسێك ئەرکی پێداچونەوەو خوێندنەوەی کتێبو نووسراوی دەخرێتە ئەستۆ پێش چاپکردنیان بۆئەوەی سانسۆریان بکاو رستەو وشەگەلێك کەلەگەڵ بارو دۆخەکە نەگونجێ لایبەرێ.

المُرَاقَب: پیاو خراپێك کە پیاوانی ئاسایش دەیخەینە ژێر چاودێری خۆیانەوە بۆئەوەی بزانن هەڵسو کەوتی چۆنەو نەهێڵن خراپەکاری بکا.

المُرَاقِب: چاودێر ٥ ئەو کەسەی چاودێری کردن دەکاتە پیشەی خۆی.

المَرْقَب: شوێنی چاودێریی کردن ٥ (ك: مَراقِب).

المَرْقَبَة: بەمانا (المَرْقَب) دێ (ك: مَراقِب).

رَقَحَ رَقْحاً ورقاحَة: کاسبی کرد، خێزانو منداڵی خۆی بەخێوکردن، دەگوترێ: (هو راقِحَة أهله).

رَقَّحَ الشَّیْءَ: شتەکەی رێك خستو چاکی کردەوە.

رَقَّحَ مالَهُ: ماڵو سامانی خۆی رێك خست، سەروکاری کرد.

ارْتَقَحَ رأسُ المال: پارەو پولەکەی بەهۆی چاودێری کردنەوە گەشەی کرد.

تَرَقَّحَ: کاسبی کرد، هەوڵی دا بۆ دابینکردنی بژێوی ماڵو خێزانی خۆی.

الرَّقاحِيُّ: بازرگانێك زۆر بەخەم ماڵو سامانی خۆیەوە بێ.

رَقَدَ رَقْداً ورُقُوداً: نوست ٥ (رَقَدَ عن الأمر): وازی لەئیشەکە هێنا ٥ گوێی بەئیشەکە نەدا لێی غافڵ بوو.

رَقَدَ عن الضیف: گرنگی بەمیوانەکە نەدا.

رَقَدَ الحَرُّ: گەرما نەما.

أرْقَدَهُ: نواندی.

رَقَدَ المكانَ: لەو شوێنە مایەوە.

رَقَّدَهُ: بەمانا (أرقَدَهُ) دێ.

ترقَّدَ: خۆی بەنوستوو خست.

أرْقَدَ: خێرا رۆیشت.

اِسْتَرْقَدَ: هەنەوز سواری بوو.

الرَّاقُودُ: کۆلێنەو کوپەی گەورەو قوڵ.

الرُّقْدَةُ: گەرمای دوا سەرما.

الرُّقُودُ: ئافرەتێك ناز پەروەر بێو کێشتەنگاوان بخەوێ.

**المَرْقَدُ**: شوێنی نوستن‌و پاڵکەوتن ٥ گۆڕو ئارامگا.

**المُرْقِدُ**: دەردێکە ئادەمیزاد بێهۆش دەکا ٥ بێ ئاگای دەکا.

**رقرق الماءَ وغيره**: بەهێواشی ئاوەکەی رشتە ناو شتەکەوە.

**رقرق عينَهُ**: چاوی فرمێسکی ڕژاندن.

**رقرق الشَرابَ**: شەرابەکەی تێکەڵ بەشلەمەنی تر کرد.

**رقرق الثريدَ بالدسم**: تێکوشاوی تێکەڵ رۆناو کرد.

**رقرق الطيبَ في الثوب**: بۆنی خۆشی پۆشاکەکەی کرد.

**تَرَقْرَقَ الماءُ وغيره**: ئاوەکە بەهێواشی هەڵڕژایە خوار، یان بەهێواشی رۆیی.

**تَرَقْرَقَ الماءُ وغيره**: ئاوەکە شڵەقاو شەپۆلی دا، یان بەهێواشی ڕەوان بوو کشا، دەگوترێ: (ترقرق الدمع من العين): فرمێسک لەچاودا قەتیس ما.

**تَرَقْرَقَ عينه**: چاوی فرمێسکی رژاند.

**تَرَقْرَقَ السرابُ**: تراویلکەکە درەوشایەوە، بریسکەی دا.

**تَرَقْرَقَت الشمسُ في طلوعها**: خۆر لەکاتی هەڵهاتنی دا واهاتە بەرچاو بسوڕێتەوە.

**تَرَقْرَقَ الحيوان لِلسّمن أو الهزال**: ئاژەڵەکە خەریکە قەڵەو بێ یان بەرەو لاواز بوون بچێ.

**الرُقارِقُ**: ئەو شتەی بدرەوشێتەوە یان تێکەوە بهاوێ.

**الرُقارِقُ من الماء**: ئاوی کەم ٥ چۆڕە ئاو.

**الرُقارِقُ من الثياب**: پۆشاکی تەنک.

**الرُقارِقُ من الشراب**: شلەمەنی رون.

**الرُقارِقُ من السيوف**: شمشێری بریسکەدار.

**الرُقراق**: بەمانا (الرُقارق) دێ ٥ هەرشتێك بدرەوشێتەوە.

**الرُقراق من الدّمع**: فرمێسکی قەتیس ماو یان زمنگۆڵ زمنگۆڵ ٥ (جارية رقراقة): کچۆڵەیەکی تەڕو تازەو دەم‌و چاو تەڕو گەش ٥ (رقراقة البشرة): پێست سپی درەوشاوە.

**رَقَشَهُ**: زەخرەفەی کردو نەخشاندی ٥ جوانی کردو رازاندییەوە.

**رَقَشَ الكتابَ**: کتێبەکەی نووسیەوەو خاڵی لەسە پیتەکان دانا.

**رَقَشَ النَّمَّامُ كلامَهُ**: فیتنە جویەکە قسەکانی خۆی ڕازاندنەوە بۆ ئەوەی مەبەستەکانی بپێکێ.

**رَقِشَ رَقَشاً ورقشةً**: خاڵخاڵاوی‌و بەڵەك بوو ٥ (هو أرقش وهي رقشاء) ٥ (ك: رُقْش).

**الرُّقشاءُ**: بەمانا (الرُّقاش) دێ ٥ جۆرە کرمێکە ڕەنگاو ڕەنگ خاڵی زەردو سوری تێدان جوانو سەرنج ڕاکێشە لەناو گژوگیادا دەژی.

**الرُّقشة**: ڕەنگێکی خاڵخاڵاوییە، یان تێکەڵە ڕەنگێکە لە لیڵو ڕەشوبۆر.

**رَقَصَ** رَقْصاً: سەمای کرد، جەستەی خۆی جوڵاندەوە لەسەر شێوەو هەوای مۆسیقا یان گۆرانی ٥ بەشێوەی لارو لەنجەو خۆبادان ڕۆیشت.

**رَقَصَ النَّبيذُ**: سرکەکە هەڵچوو.

**رَقَصَ في الكلام**: خێرا خێرا قسەی کردن.

**رَقَصَ الجملُ**: حوشترەکە کەوتە سەر ڕەوتو جوان ڕۆیی.

**أرقَصَ في سيره**: بەمانا (رَقَصَ)دێ.

**أرقَصَ فلاناً**: فلانکەسی هەڵنا بۆ سەماکردن.

**أرقَصَت المراةُ وَلَدَها**: ئافرەتەکە منداڵەکەی هەڵتەکاند ٥ هەڵی پەڕاند.

**أرقَصَ فلانٌ الدّابّةَ**: فلانکەس ولاخەکەی هاندا بۆ خێرا ڕۆیشتن.

**رَقَّصَهُ**: بەمانا (أرقَصَهُ)دێ.

**ترقَّصَ**: بەمانا (رَقَصَ)دێ.

**الراقِصَةُ**: سەماکەر ٥ (ليلة راقصة): شەوێکە سەمای تێدا بکرێ.

**الرَّقْصُ**: جوڵاندنی بەشێکە لەجەستە یان زۆربەی لەسەر شێوەی مۆسیقاو گۆرانی، بەزۆری بەهەڵتەکاندنی شان یان سمت یان دوو دەست ئەنجام دەدرێ ٥ بۆ دەربڕینی جۆرە مانایەك لەماناکان ٥ چەند جۆری هەیە.

**الرَّقَصُ**: قسەو قسەلۆك، دەگوترێ: (سمعت رَقَصَ الناسِ علينا): گوێم لەقسەی ناشیرینی خەڵك بوو دژی ئێمە ٥ هەروا دەگوترێ: (لە رَقَصٌ في كلامه): لەقسەکردن دا پەلە پەلیەتی.

**الرَّقّاصُ**: کەسێك زۆر سەما بکا، پیشەی سەماکردن بێ ٥ بەندۆڵی کاتژمێر.

**الرَّقّاصَةُ**: ئافرەتێك پیشەی سەماکردن بێ ٥ زەوییەك ئاویش بدرێ هیچی لێ نەڕوێ.

**المَرْقَصُ**: شوێنی سەماکردن ٥ (ك: مراقص).

**المَرْقَصَةُ**: بەمانا (المَرْقَصُ) دێ ٥ (ك: مَرَاقِصَ).

**رَقَطَهُ رَقْطاً**: خاڵی تێدا دروست کردن.

**رَقِطَ** رَقَطاً: خاڵی پێوە بوون ٥ (هو أرقط وهي رقطاء).

**رَقَّطَهُ**: بەمانا (رقطه)دێ ٥ دەگوترێ:

(رَقَطَ على ثوبه): بۆیەو ڕەنگی بەسەر پۆشاکەکەی دا پژاند.

تَرَقَّطَ: پەڵە پەڵە بوو ٥ دەگوترێ: (تَرَقَّط النسیجُ): قوماشەکە گوڵ گوڵ بوو ٥ (هو أرقط وهي رقطاء).

الأرْقَطُ: پڵنگ ٥ هەرگیانلەبەرێك ڕەنگی خاڵخاڵو بەڵەك بێ.

الرَّقطُ: نوختەو خاڵ.

الرَّقطاء: مێینەی (الأرقط)ە ٥ جۆرە مارێکە ٥ تێکوشاوێکی چەوری وەها رۆنەکەی لەسەر ڕاوەستابێ پەڵە پەڵە.

الرُّقْطَة: ڕەنگێك لەسپیو ڕەش تێکەڵاو بێ ٥ یان لەڕەنگی سورو زەردو هی تر تێکەڵ بوو بێ.

رَقَعَ الشیخُ رَقعاً: پیرەمێردەکە یان پیرەژنەکە لەکاتی هەستان دا هەردوو دەستی دادان.

رَقَعَ في سیره: خێرا ڕۆیشت ٥ دەگوترێ: (مارقع فلان رقعاً): فلانکەس هیچی بۆنەکرا، هیچی نەکرد.

رَقَعَ الثَّوْبَ والحذاءَ رقعاً ورقعةً: کراسەکەی پینەکرد ٥ پێڵاوەکانی پینەکردن.

رَقَعَ البناءَ: پاڵپشتی بۆ بیناکە دانا، دەیرەگی بەردا.

رَقَعَ أمورَهُ: کاروباری خۆی ڕێك خست.

رَقَعَ فلاناً: لەفلانکەسی دا ٥ (رَقَعَهُ بکفّ أو بسهم): بەشەپلاغەی لێ دا، تیری پێوەنا.

رَقَعَ الأرض برجله: بەقاچ زەوییەکەی کوتایەوەو پێ پەستی کرد.

رَقُعَ رقاعَةً: ئەحمەق بوو گێل بوو.

أرْقَعَ الثوبُ وغیره: پۆشاکەکە کاتی پینەکردنی هاتووە.

أرْقَعَ فلان: فلانکەس بێ عەقڵییەکی زۆری کرد شتێکی ناشیرینی ئەنجام دا.

رَاقَعَ الخَمرَ: بەردەوام بوو لەسەر خواردنەوەی مەی.

رَقَّعَهُ: بەمانا (رَقَعَهُ) دێ.

رَقَّعَ البناءَ: پاشکۆڵی بۆ بیناکە دانا، دیرەگی بەردا.

رَقَّعَ أموالَهُ أو معیشته: ماڵو سامانی خۆی ڕێك خست یان ژیانی خۆی ڕێك خست.

رَقَّعَ الحدیثَ: لەقسەکەی زیادکردو کەمو کوڕی تێدا نەهێشت.

إرْتَقَعَ: دەگوترێ: (ما أرْتَقِعُ لە أو بە): گرنگی پێ نەدا ٥ (ما ترتقع مني برقاع): گوێ بەئامۆژگاری من نادا ٥ یان هیچم بەقسە ناکا.

تَرَقَّعَ: کاسبی کرد.

استَرقَعَ: کاتی ئەوەی هاتووە پینەی بکەی، دەگوترێ: (استرقع الثوبُ).

**الأَرْقَعُ**: ئەحمەق‌و گێل ٥ ئاسمانی دونیا لـــەم ڕووەوە کەبـــە ئەســـتێرە ڕازاوەتەوە ٥ (ك: رُقُعٌ).

**الترقيـــع**: (ترقيـــع الجـــروح): ئەوەیـــە برینەکە پاك بکرێتـەوە ئـەمجار بە پارچـە پێـستێکی شوێنێـکی تـری جەستەی داپۆشرێ.

**الرُّقاعَة**: گێلی‌و بێ عەقڵی ٥ بێ حەیاو بێ شەرم.

**الرَّقاعي**: کەسێـکە زۆر دەربەست ماڵ‌و سـامانی خـۆی بـێ‌و هەمیـشە خەریکی ڕێك‌و پێك کردنی بێ.

**الرَّقيعُ**: ئاسمانی حەوتەم.

**الرَّقعاءُ**: ئـافرەتی گێـل ٥ شتی ڕەنگاو ڕەنگ ٥ ئافرەتی قاچ باریك.

**الرُّقعَـةُ**: پینـە، پارچـەیەك پینـەی پـێ بکـرێ ٥ کوتـە کاغەزێـك پارچـە پێـستێك شـتی لەسـەر بنوسـرێ ٥ پارچە زەوی پەڵەگیاو گژو لەوەڕگا.

**رقعة الشطرنج**: پارچـە تەختەیـەك کـە چوارگۆشە چوارگۆشە کراوە.

**خطّ الرُّقعة**: جـۆرە خـەت‌و نوسینێـکە نامەی پێ دەنوسرێ.

**الرُّقَعَـةُ**: جـۆرە درەختێـکە زەبـەللاح‌و گـــەورە گەڵاکـــەی وەکـــوو گـــەڵای کولەکـە وایـە، بەرەکـەی وەکـوو هەنجیر دەچێ.

**الرُّقيعُ**: گێل‌و ئەحمەق ٥ ئاسمان.

**المَرْقَعانُ**: گێـل‌و نـەفام ٥ (مَرْقَعانـة): بۆ مێینە بەکاردێ.

**المَرْقَعُ**: شوێنی پینەکردن.

**المِرْقَعُ**: دەگـوترێ: (خطيب مِرْقَع): وتـار بێژێـکە قـسە دەخاتـە پـاڵ قـسەو ڕێکیان دەخاو وتارێکی جوانی لـێ پێك دێ.

**المُرَقَّـعُ**: پیـاوی قـاڵبوو لەبۆتـە دراوو خاوەن ئەزمون.

**المُرَقَّعَـةُ**: پۆشاکی صۆفیان لـەم ڕووەوە پینە پینە بێ.

**رَقَّهُ رَقّاً ورَقَّةً**: تەنکی کرد.

**رَقَّ رَقّـاً ورِقَـةً**: باریـك بـوو کـزو لاوزاو ناسك‌و لەتیف بوو.

**رَقَّ عَظْمُهُ**: ئێسقانی زەعیف بوو، پیر بـوو، بەساڵا چوو.

**رَقَّ عـددە**: تەمـەنی کـەم بـوو ٥ پێـستی داماڵدراو هێزی نەما.

**رَقَّ حالُـهُ**: هـەژار کـەوت‌و مـاڵ‌و سـامانی نەما ٥ ئاسان بوو، نەرم بوو.

**رَقَّ لـه**: بـەزەیی پێـدا هـات ٥ گەردنکـەچ بـــوو، ملـــی دا ٥ شـــەرمی کـــرد ٥ دەگـوترێ: (رقّ وجهُـــهُ): بـەڕوان تەنك بوو.

**رَقَّ الحُـرُّ**: ئازادەکـە بـوو بەکۆیلـە ٥ (ك: أرقاء).

أرَقَّ: بەمانا (رَقَّ) دێ.

رَقَّ الفَرَسُ ونحوه: ئەسپەکە سمی تەنك بوو.

رَقَّ فلاناً: فلانکەس بارو دۆخی نالەبار بوو، هەژار کەوت.

رَقَّ به أخلاقُهُ: چروك بوو خێرو بێری نەما.

رَقَّ الحُرُّ: ئادەمیزادەکەی کردە کۆیلە ◊ هەڵی گێڕایەوە، بە ئامۆژگاریو قسەی جوان نەرمی کرد.

رَقَّقَ قَلْبَهُ: دڵی دایەوەو نەرمی کرد.

رَقَّقَ كلامَهُ: قسەکانی نەرمو نیان کردن، قسەی جوانی وتن.

رَقَّقَ مَشْيَهُ: بەهێواشی رۆیی.

رَقَّقَ بينهما أو مابينهما: نێوانی ئەو دوکەسەی تێك دا.

تَـرَاقَّ هَرَمُهُ: راوو بۆچوونی گەیشتە کۆتایی.

تَرَقَّقَ: بەمانا (رَقَّ) دێ ◊ بەهێواشی رۆییشت، زەلیلو مل کەچی کرد ◊ دەگوترێ: (ترقَّقتِ الحسناءُ فلاناً): ئافرەتە جوانەکە فلانکەسی ژێردەستە کردو دڵی لێ ستاندو کردویەتی بەکۆیلە.

اسْتَرَقَّ الماءُ ونحوه: ئاوەکە رۆچوو جگە لەکەمێکی.

اسْتَرَقَّ الليلُ وغيره: شەوەکە زوربەی رۆیشت.

اسْتَرَقَّ الأسيرَ: بەدیل گیراوەکەی کردە کۆیلە.

اسْتَرَقَّ الحُرَّ: مامەڵەی کۆیلەی لەگەڵ پیاوە ئازادەکە کرد.

الرَّقَاقُ: زەوی دەشتو نەرمەڵان ◊ ئەو چاڵاییەی ماوەیەك ئاوی تێدا راوەستاوەو دوایی ئاوەکە رۆچووە، دەگوترێ: (أرض رقاق): زەوییەکی نەرمەڵانە، گڵە وردەیە ◊ (یوم رقاق): رۆژێکی گەرمە.

الرُّقَاقُ: کۆیلە ◊ نانی تیری ◊ رۆیشتنی لەسەرە خۆ.

الرَّقُّ: چەرمێکە تەنك بۆ تێدا نوسین بەکاردێ ◊ لاپەڕەی سپی ◊ ئاوی کەم لەبنکی دەریادا یان لەشیوو دۆڵ دا ◊ کیسەڵی گەورە ◊ گیانلەبەرێکی ئاوییە وەکوو تیمساح وایە ◊ (ك: رقوق).

الرِّقُّ: شتی تەنك ◊ بەندایەتی ◊ زەوی نەرمەڵانی پانو پۆڕ ◊ ئەو چرۆو سەرە تەرزانەی ئاژەڵ بەناسانی دەمی دەیگاتێو بەلایەوە خۆشە ◊ (ك: رُقوق).

الرُّقُّ: ئاوی تەنکاو ◊ ئاوی کەمی بنکی دەریاو ناو شیو ◊ زەوی نەرمەڵانی پانو پۆڕ ◊ (ك: رقوق).

الرِّقّ: نەرمیو سوکی ◦ تەنکی ◦ زەوی نەرمەڵانو پانو پۆڕ ◦ لاوازیو بێ هێزی.

الرِّقّة: بەمانا (الرَّقاق)دێ ◦ یان هەر زەوییەکی دەم ڕوبارە کە لەکاتی هەستانی ئاوەکە دا ئاوی بگاتیو کەچەمەکە نیشتەوە ئاوەکەی لەسەر نامێنیو زەوییەکە بۆ ڕوەك تێدا ناشتن لەبارە.

الرَّقِيقُ: شتی باریكو تەنك ◦ كۆیلە.

المَرَقّ: هەرشتێك باریك یان تەنك بێ ◦ (مرق الأنف): نەرمەی لوت ◦ (ك: مَرَاق)ە ◦ (مراق البطن): نەرمەی ورگ ◦ لای خواروی ورگ.

المِرْقاقُ: تیرۆك؛ دارێكە نانی پێ پان دەكرێتەوە.

المُرَقَّقُ: نانی تەنك، نانی تیری.

المُسْتَرَقُ من الشَّيْئ: نەرمەی شت.

أَرْقَلَ في سيرِه: پەلەی كرد لەڕۆیشتنی دا.

أَرْقَلَت النخلةُ: دارخورماكە درێژ بوو، هەڵچو.

الراقول: حەبلێكە بەكاردێ بۆ چونە سەر دارخورما ◦ (ك: رواقيل)ە.

الرَّقْلَةُ: دارخورمای بەرز ◦ (ك: رِقال).

المِرْقالُ: تیژڕۆ، یان ڕۆیندەو زۆر ڕەو.

رَقَمَ الكتابَ وعليه وفيه رَقماً: كتێبەكەی نووسی ◦ (هو يَرْقُمُ على الماء): بەكەسێك دەگوترێ كاری بێ سود بكا، بەئیشی هیچو بوچەوە خەریك بێ.

رَقَّمَ السِّلْعةَ: كاڵاكەی نیشانەكرد، نرخی لەسەر دانا ◦ مۆری لێ دا، جۆرەكەی دیاریكرد.

رَقَّمَ الكتابَ والثوبَ: بەمانا (رَقَمَ)دێ.

الأَرْقَمُ: نێرە مار یان ماری زاراوی پیس ◦ (ك: أراقِم).

الترقيمُ: خاڵبەندی؛ دانانی خاڵو فاریزەو داشو نیشانەی پرسیارو سەر سوڕمان.

الرَّقْمُ: خەتی گەورە ◦ نیشانەكردن ◦ مۆر لێ دان ◦ نرخ لەسەر شت دانان ◦ ناوزەدكردنی قوماش ◦ هەروا ناوە بۆ ژمارە سادەكان: (١-٢-٣-٤-٥-٦-٧-٨-٩).

الرَّقم القياسي: ژمارەیەكە كە پێشبڕكێ كار لای زوروی لێ بەدەست دێنێ، وەكوو ئەوە ڕاكەرێك لەماوەی دە چركەدا هەزار مەتر ببڕێو كەسانی تر بە (١٥)چركە ئەو مەودایەیان بڕیبێ.

الرُّقمةُ: باخچە ◦ قەراخی شیو، یان زۆنگاو، یان شوێنی كۆبونەوەی ئاو ◦ ڕوەكێكە ئاوی خوبازایە ◦ ئێسقانێكە لەشێوەی نینۆك لەسەرو باریكایی دەستی وڵاخەوە

دەردەکەوێ ٥ خاڵێکی خڕە لەشێوەی دیرهەم دا.

**الـرَّقيمُ**: کتێب ٥ ئاسمان ٥ گوندی (أصحاب الكهف)، یان ئەو کێوەی بۆی چوون، یان شیوەکە یان ئەو بەردو ئەشکەوتەی چونە ژێری، یان ئەو رەصاصە یان ئەو لەوحەی زانیاری دەربارەی (أصحاب الكهف)ی پێ نوسراوەو لەسەر نوسراوە.

**المُرَقِّمُ**: نووسەر.

**المِرْقَمُ**: قەڵەمو پێنووس، دەگوترێ: (طاح مِرْقَمُك): قەڵەمەکەت هەڵەی کرد، تیژ ڕۆیی کرد ٥ ئامێرێکە نانو کولێرەی پێ نەخش دەکرێ ٥ ئوتو.

**رَقَنَتِ المـرأةُ رَقْنـاً**: ئافرەتەکە بەزەعفەران قژی خۆی رەنگ کرد.

**رقَنَ الشعرَ**: قژەکەی ڕەنگ کرد.

**أرْقَنَ**: بەزەعفەران خۆی ڕەنگ کرد.

**أرْقَنَ شعرَهُ**: بەمانا (رَقَنَهُ) دێ.

**أرْقَـنَ الطعـامَ**: رۆنـی تێکەڵاوی خواردنەکە کرد.

**رَقَّنَتِ المراةُ**: بەمانا (رَقَنَتْ)دێ.

**رقَّـنَ الكتـابَ**: بەشـێوەیەکی جـوان کتێبەکەی نووسییەوە.

**رقَّنَ الثَّوبَ**: کراسەکەی بەزەعفەران ڕەنگ کردو ڕازاندییەوە.

**ارْتَقَنَ**: بەمانا (أرْقَنَ)دێ.

**الأرقان**: خەنە ٥ زەعفەران.

**الرَّاقِنُ**: ڕەنگی جوان.

**الرَّقان**: بەمانا (الإرقانُ) دێ.

**الرَّقَنُ**: هێلکەی داڵاش و داڵ.

**الرَّقون**: خەنەو وسمەو زەعفەران.

**الرَّقِينُ**: بەمانا (الرَّقيم) دێ ٥ دیرهەمو شتی لەو جۆرە.

**رَقَا الطائرُ**: باڵندەکە بەرز بووە.

**رَقَى المريضَ ونحوَهُ رَقْياً ورُقِياً**: نوشتەو دوعای بۆ نەخۆشەکە کرد.

**رَقَيْتُ فلاناً**: تەمەلوق و سازشکاریم بۆ فلان کرد.

**رَقِيَ رَقْياً ورُقِياً**: سەرکەوت، بەرزبۆوە.

**رَقِيَ الجبلَ**: چووە سەرکێوەکە.

**رَقِيَ الدَّرَجَ**: بەپەیژەکە دا سەرکەوت.

**رَقِيَ علي الباطلَ**: شتە بەتاڵەکەی بەسەرم دا تێپەڕاند ٥ شتێکی بەدەم منەوە هەڵبەست کەنەم گوتووە.

**ارْتَقَى**: بـەرز بۆوە ٥ (ارتقـى العـرشَ): چـووە سەرکورسـی دەسـەڵات، بـوو بەپاشا.

**ارْتَقَى بطنه**: ورگی پڕبوو، تێر بوو.

**تراقى**: هەڵکشا، بەرز بۆوە، دەگـوترێ: (تراقى أمرهم الى الفساد).

**تَرَقَّى**: بـەمانا (ارتقـى) دێ، دەگـوترێ:

(تَرَقّى فلان من حال الى حال): لەحاڵو وەزعێکەوە چووە ناو بارو دۆخێکی ترەوە.

**تَرَقّى العامِلُ**: کرێکارەکە پلەی بەرز بۆوە لەپلەیەکەوە بۆ پلەیەکی بەرز تر.

**تَرَقّى في العلم وغيره**: پلە پلە لەخوێندنو زانیاریی دا بەرز بۆوە.

**استرقى فلاناً**: داوای لەفلان کرد دوعاو نوشتەی بۆ بکا.

**الراقي**: نوشتەکار ٥ خاوەن نووشتەو دوعا.

**الرَّقّاء**: بەمانا (الراقي) دێ، کەسێك چوبێتە سەر کێو.

**الرَّقْوُ**: کۆمەڵە گڵ یان کۆمەڵە لمب.

**الرَّقْوَةُ**: بەمانا (الرقوُ) دێ، پلەو پلیکانە.

**الرُّقْيَةُ**: نووشتەو دوعا بۆ نەخۆشو شتی وا.

**المَرْقى**: شوێنی بەرز بوونەوە.

**المِرْقاةُ**: هۆکاری بەرز بوونەوە ٥ پەیژەو پلیکانە ٥ یان شوێنی بەرز بوونەوە ٥ (ك: مراق) ٥ دەگوترێ: (المجد صعب المراقي).

**رَكَبَهُ**: لەئەژنۆی دا یان بەئەژنۆ لێی دا.

**رَكِبَ رَكَباً**: ئەژنۆی گەورە بوو یان یەکێکیان گەورە بوو ٥ (هو أركبُ وهي ركباء) ٥ (ك: رُكْبٌ).

**رَكِبَ الشَّيْءَ عليه وفيه**: سواری شتەکە بوو، چووە سەری، دەگوترێ: (ركب في السفينة)، هەروا دەگوترێ: (رَكِبَ الشَحْمُ بعضُه بعضاً): بەز قات قات چووە سەریەك.

**رَكِبَ الدينُ فلاناً**: قەرز سواری شانو ملی فلان بوو.

**رَكِبَ فلان رأسَهُ**: بەنەشارەزایی ملی رێگای گرت.

**رَكِبَ الذَّنْبَ**: تاوانی ئەنجام دا ٥ ئیشی خراپی کرد.

**رَكِبَ فلاناً**: شوێن فلانکەس کەوت ٥ لەحەدیث دا هاتووە: (فإذا عُمر قد رَكِبَنِي): روانیم عومەر بەشوێنم دا هات.

**رُكِبَ**: ئەژنۆی ئازاری پەیدا کرد.

**أرْكَبَ المهرُ**: جوانووەکە کاتی سواربوونی هات، دەگوترێ: (دابة مُرْكِبةٌ): ولاخێکە کاتی سواریی هاتووە.

**أرْكَبَ فلاناً**: فلانکەسی سوار کرد ٥ لەدوا خۆیەوە سواری کرد یان ولاخی سواریی بۆ دابین کرد.

**رَكَّبَهُ**: سواری کرد.

**رَكَّبَ الشَيْءَ**: شتەکەی خستە سەریەك

٥ تێکی خستو شتەکانی تێکنانو کردنی بەیەك پارچە ٥ دەگوترێ: (رَكّبَ الفصَّ في الخاتم) و(رَكّبَ السنانَ في الرمح) و(ركّبَ الكلمة او الجملةَ) و(ركّبَ الدواء).

إرْتَكَبَ ذنباً أو قَبيحاً: تاوانی کرد، کاری ناشیرینی ئەنجام دا.

تراكَبَ الشَّيْئ: شتەکە هەندێکی کەوتە سەر هەندێکی.

تَرَكّبَ: دەگوترێ: (تَرَكّبَ الشّيْئُ من كذا): ئەو شتە لەوە پێك هاتووە.

إستَرْكَبَهُ: داوای لی کرد سواری بکا.

التَّراكُبُ: لەزانیاری رووەکناسی دا زیادبوونی دیواری خانەیە لەبارەی ئەستورییەوە بەو جۆرە مادەی ئەستورەکە تووێ تووێ بچنە سەریەك.

التركيب: لەزانیاری فەلسەفەدا پێکهاتنی شتە لەپێکهاتە بەسیتەکانی ٥ پێچەوانەی (التحليل)ە.

الرّاكِب: سەرە تەرزەی لقە خورما کەبەرەو زەوی شۆڕ دەبنەوەو ناگەنە زەوی، یان لەبنکی درەختی خورما دێنە دەرەوەو ڕەگی نییە ٥ تۆقە سەری کێو.

الرّاكِبَةُ: مێینەی (الرّاكِبَ) ٥ (ك: رواكب).

الرّاكوب: بەمانا (الرّاكب) دێ.

الرِّكاب: ئاوزەنگی ٥ حوشتری سواریی ٥ یان حوشتری بار هەڵگر.

الرَّكَبُ: خوار ناوك، شوێنی بەر لێ ڕوان ٥ کۆتایی ڕان ٥ سپاییەکە لەئەژنۆدا.

الرُّكُبان: (رُكبان السنبل): ئەو گوڵە گەنمانەی زوو دەردەکەون دەبنە نۆ نەخشەی ئەوانی تر.

الرُّكْبَةُ: ئەژنۆ.

الرَّكيبُ: کەسێك زۆر سواری وڵاخ بێ، یان سوارچاك بێ.

الرَّكوبُ: وڵاخی سواریی‌و شتی لەو جۆرە ٥ (طريق ركوب): ڕێگایەکی خۆش‌و تەختە.

الرَّكوبَةُ من الدواب: بەمانا (ألرّكوب) دێ ٥ یان بەمانا وڵاخی تایبەتە بۆ سواریی ٥ (ك: ركائب).

الرَّكيب: کەسێکە لەگەڵ یەکێکی تردا سوار بووبی، دەگوترێ: (هو ركيب فلان).

ألمُرَكَّبُ في الشّيْئِ: وەکوو مێروی ناو ئەنگوستیلەو شتی وا ٥ باخ‌و زەوی کشتوکاڵ ٥ ئەمامە خورما کەلەسەر جۆگا بەرێز چەقێنرابن ٥ پارچە زەوییەك قەراخەکانی

هەڵدرابنەوەو بگونجێ بۆ کشتوکاڵ ٥ هەروا ناوە بۆ جۆگایەك بکەوێتە نێوان دوو پارچە زەوییەوە یان بکەوێتە نێوان دوو باخی دارخورماو ڕەز.

**اَلْمَرْكَبُ**: هەرشتێك بۆ سواری بشێ لەوشکانی یا لەناو دەریادا ٥ وەلێ بەزۆری بۆ کەشتی بەکاردێ.

**اَلْمُرَكِّبُ**: بنەماو شوێنی ڕوان ٥ بنەچەو نەژاد ٥ (هو كريم المُرَكَّب): ئەو وەجاخزادەیە ٥ (الجهل المُرَكَّب): ئەوەیە کابرا نەزانێ‌و نەشزانێ کەنازانێ ٥ وشەی (مُرَكَّب): لەزانیاری مەنتیق دا ئەوەیە بەشێك لەوشەکە بەشێکی ماناکەی بگەیەنێ ٥ وەکوو (کاتب المقالة).

**اَلْمَرْكُوبُ**: هەرشتێك بشێ بۆ سواری.

**رَكَحَ اليه رَكْحاً**: پەنای بۆ برد، پشتی پێ بەست.

**أَرْكَحَ اليه**: بەمانا (رَكَحَ)دێ.

**أَرْكَحَ شيئاً اليه**: شتەکەی کردە پاشکۆڵ‌و پشتیوان، دەگوترێ: (أَرْكَحَ ظهره الى كذا).

**إِرْتَكَحَ الإِناءُ**: قاپەکە پڕبوو لەشۆرباو.

**إِرْتَكَحَ إِلى الشَّيْئِ**: بەمانا (رَكَحَ)دێ.

**تَرَكَّحَ بالمكان**: لەو شوێنە مایەوە ٥ هەوڵی فراوانکردنی دا.

**الرُّكْحُ**: سوچ‌و پەنا ٥ بەربێلا ٥ بناغە ٥ماڵی ڕەبەن‌و دەروێش.

**الرُّكْحَاءُ**: تەپۆڵکە زەوی سەخت ٥ (ك: رُكْحٌ).

**الرُّكْحَةُ**: ساحە ٥ بەربێلا ٥ پارچە تێکوشاو کەلەبنکی قاپ دا مابێتەوە ٥ (ك: رُكَحٌ).

**المِرْكاحُ**: ئەوکەسەی زۆر لەسەر پشتی وڵاخ بمێنێتەوە.

**رَكَدَ رُكُوداً**: هێواش بووەو ئارامی گرت.

**رَكَدَ السوقُ**: بازاڕ وەستاو مامەڵەی تێدا نەکرا.

**رَكَدَ الميزانُ**: تەرازووەکە هەردوو تاکەی بەرامبەر یەك وەستان.

**رَكَدَ رِيحُهُمْ**: بای بەختیان ڕۆییشت ٥ هێزو دەسەلاتیان نەما.

**أَرْكَدَهُ**: جێ نشینی کرد، دای نیشاند.

**الرَّاكدة**: سێ کوچکە.

**الرُّكود**: ئەو شیردەرەی ماوەی شیردانی درێژە بکێشێ ٥ کوڵینەو کەندوی پڕ لەشت.

**رَكْرَكَ**: لاواز بوو ٥ ترسنۆك بوو.

**تَرَكْرَكَ السقاءُ**: مەشکەکە ژاو ڕۆنەکەی سەرکەوت.

**رَكَزَ شيئاً في شيئ**: شتەکەی چەقاند لەشتەکەدا، دەگوترێ: (ركز السهم

في الأرض): تیرەکەی لەزەوی چەقاند ٥ (رَكَزَ اللهُ المعادن في الأرض): خودا کانی زۆری لەزەوی دا بەدیهێناون ٥ هەروا دەگوترێ: (هذا شَيْءٌ مَرْكُوزٌ في العقول).
أَرْكَزَ المَنْجَمُ ونحوه: کانەکە مەعدەنی تێدا دۆزرایەوە.
أَرْكَزَ فلان: فلانکەس کانی دۆزییەوە.
أَرْكَزَ صاحب المعدن: خاوەن کانەکە زێوی زۆری بۆ لێ دەرهێنا.
رِكْزَة: بەمانا (رَكَزَة)دێ.
أَرْكَزَ اللَّبَنَ: ماستەکەی خەست کردەوە.
أَرْكَزَ فِكْرَهُ: سەرنجی خۆی تێدا کۆکردەوەو دیقەتی دا.
إِرْتَكَزَ: جێگیر بوو، وەستا.
إِرْتَكَزَ عليه: پشتی پێ بەست.
تَرَكَّزَ: جێگیر بوو خۆی چەسپاند.
الإرتكاز: (نقطة الإرتكاز): ئەو شوێنە چەسپاوەی هاوسەنگی نێوان هێزی پاڵنەرو هێزی بەرگری دەکا ٥ (اتخذ الجيش مدينة كذا نقطة ارتكاز): واتە: سوپا فلانە شاری کردە بارەگا.
الرِّكَازُ: ئەو مەعدەنە سروشتیانەن کە لەزەوی دا خودا بەدیهێناون ٥ گەنجو خەزێنە ٥ ماڵو سامانی شێردراوە لەژێر زەوی دا کە بگەڕێتەوە بۆ پێش هاتنی ئیسلام.
الرِّكْزُ: چرپەو ورتە ٥ (ك: ركوز وأركاز)ە.
الرِّكْزَةُ: تاکی (الرِّكَاز)ە ٥ نەمامە خورما کەلەقەدی دارخورما بڕوێ‌و دوایی هەڵبکەندرێ‌و لەشوێنێکی تر بڕوێندرێ ٥ دامەزراوی عەقڵ‌و ئاوەز، دەگوترێ: (مارأيت له ركزة عقل).
الرَّكِيزَة: ئەو شتەی قورسایی دەخرێتە سەرو دەبێتە جەمسەر ٥ پارچە مەعدەنێکی بەنرخ کەلەژێر زەوی دا شار درابێتەوە ٥ پارچە ئامێرێکی مۆسیقایە.
المُرْتَكِزَة: لاسکی ڕوەك کەگەڵاو پرژەکانی پێوە نەمابن.
المَرْكَزُ: مەڵبەندو بارەگای سەرەکی کە لق‌و پۆپی تری لێ ببنەوە.
مركز الجند: مەڵبەندی سەربازو پێشمەرگە کە فەرمانیان پێ کرابێ تێیدا بمێننەوەو جێی نەهێڵن.
مركز الرَّجُلِ: ماڵ‌و حاڵ‌و پلەو پایەی پیاو.
مركز الدائرة: چەقی کەوانە، ناوەڕاستی کەوانە.
المركزية: یاساو نیزامێکە وڵات هەمووی پەیوەست دەبێ بەبارەگای سەرۆکەوەو هەموو کاروبارێك بەدەستی یەك کەسەوە دەبن‌و ئەو

خاوەن بڕیار دەبێ ە پێچەوانەکەی (اللامركزية)یە، کەهەندێ دەسەڵات دەدرێ بە بەشەکانی وڵاتو کاربەدەستەکانی خوار تر هەندێ بڕیاریان بەدەستەوە دەبی.

رَكَسَهُ ركساً: گەڕاندییەوە، هەڵی گێڕایەوە.

رَكَسَ الرّكاس: حەبلەکەی لەلوتی حوشترەکە کردو بەزمندی قاچییەوە شەتەکی دا بۆئەوەی زۆر جمو جۆڵ نەکا.

أرْكَسَت الجارية: کچۆڵەکە مەمکی دەرکەوتن ە بناغەی مەمکی دانا.

أرْكَسَ فلان: دەگوترێ: (أركسه في الشرّ): توشی شەڕی کردو بەقوڕا بردیە خوارێ.

أرْكَسَ الثوبَ: قوماشەکەی لەڕەنگ هەڵکێشایەوە جارێکی تر خمی کردەوە.

إرْتَكَسَ: تێشکا، پێوە بوو، ڕزگاری نەبوو ە پاڵەپەستۆی کردو هاتوو چو.

إرْتَكَسَت الجارية: بەمانا (أركست) دێ.

تراكس: سواری یەك بوو کەوتنە سەر یەك، دەگوترێ: (شَعْرٌ متراكس).

الرِّكاسُ: حەبلێکە لەلوتی حوشتر دەکرێو بەدەستیەوە دەبەسترێتەوە بۆ ئەوەی ژێر باربێ ە (ك: رُكُسٌ وأركسة).

الرُّكاسَةُ: حەبل یان شتێکی لەو جۆرە هەردو سەری دەخرێنە زەوییەوە، ناوەڕاستەکەی وەکوو کەوانە دەردەکەوێ وڵاخی پێوە دەبەسترێتەوە.

الرِّكْسُ: کۆمەڵێك ئادەمیزاد ە شتی پیسو قێزەون ە خانووی تەعمیر کراو، دەگوترێ: (بناء رَكْسٌ).

الرُّكُوسِيَّةُ: تاقمێکن ئایینێکی تێکەڵ لەئایینی مەسیحیو صابیئەیان هەیە.

الرَّكِيس: گەڕاوە، هەرشتێك قێزەون بێ ە لاوازی هەڵەو گێربوو بەگێچەڵو چورتم.

رَكَضَ رَكْضاً وركضةً: بازی هاویشت، ڕای کرد، قاچی بەزەوی کێشا.

رَكَضَ منه: لەبەری هەڵات.

رَكَضَ الطائر: باڵندەکە پەلەی کرد.

رَكَضَت النجومُ والكواكب: ئەستێرەکان کشان.

رَكَضَ الخيلُ: ئەسپەکە سمکۆڵی کرد.

رَكَضَ الدّابة: لەلاکەلەکەی وڵاخەکەی دا بەقاچی، ئاوزەنگی لێ دا بۆئەوە خێرا بڕوا.

رَكَضَ الطائر: باڵندەکە لەشەقەی باڵی دا،

بالّی لێك دان، دەگوترێ: (هو لایركض المِجَـــنَ): کەمەنــد لــەخۆی دوور ناخاتەوە.

رَكَضَ القوسُ الـسهم: كەوانەكە تیرەكەی هاویشت.

رَكَضَ النارَ بـالمِرْكَضِ: بـەمقاش ئاگرەكەی تێك وەردا.

اركـضت الحامـل: ئافرەتـە سك پڕەكـە منداڵەكەی ناوسكی جوڵایەوە.

راكَضَهُ: لە ڕاكردنو پێشبڕکێ دا پێشی كــەوت ٥ هەریــەك لەســوارەكان ئەسپی خۆیان هەلینگ دا بۆنـەوەی بــزانن کامیــان پــێش دەكــەوێ، دەگوترێ: (راكضه الخيل).

ارتكـض: بـەمانا (ركـض)دێ ٥ كەوتـە جـمو جـۆڵ ٥ دەگـوترێ: (ارتكـض الجنين في بطن أمـه) ٥ (ارتكـض قلبـه فزعـاً): لەترسا دڵـی کەوتـە پەلـە پەل.

ارتكـض فـلان في شـئونه: فلانكـەس بۆكـارو بـاری فـلان كەوتـە جـمو جۆڵ.

ارتكـض المـاءُ في البئـر: ئاوەكـە لـەناو بیرەكە كۆبۆوەو شڵەقا.

ارتكـض بعـضهم الى بعــض فرسَـــهُ: هەریەكەیان بۆلای ئەوی تر ئەسپی خۆی هەڵینگ دا.

ارتكض الخيلَ: ئەسپەكەی هەڵینگ دا.

الرّكـوض: بـەهێزو پاڵنـەر، هاوێـژەر، دەگــوترێ: (قـــوس ركـــوض): كەوانێكی توندو هاوێژەرە.

اَلْمَرْكَضُ: شوێنی ڕاكردنو جلیت بازی ٥ كەلەكـەی ولاخ ئـەو شـوێنەی بـە ئـاوزەنگی لـێ‌ی دەدرێ ٥ لێـوارو قـەراخ ٥ دەگـوترێ: (قَعَـدْنا علـى مراكض الحوض).

مراكض الحوض: ئـەو شوێنەیە ئاوەكە لـێ‌ی دەداو لـێ‌ی نادا.

المِرْكَضُ: كۆڵەوەژ، هەرشتێك شتی پـێ تێـك هەڵـدڕێ ٥ وەكـوو ئەسـكۆی، مەقاش.

المِرْكَـضَةُ: پاڵنـەر، هاوێـژەر ٥ ئەسـپی سمكۆڵ كەر.

رَكَـعَ رَكْعـاً وركوعـاً: چۆمایەوە ٥ چـوە روكـوع، دەگـوترێ: (رَكَـعَ الهَـرِمُ): پیرەكە چۆمایەوە ٥ (رَكَعَ المـصلی): نوێژكەرەكـــە چـــووە روكــــوع، چۆمایەوە تادەستی گەیشتە ئەژنۆی ٥ هـەروا بـەمانا مـل كـەچ بوونـە ٥ هەروا دەگـوترێ: (ركع الى الله): دڵی بـەخوداوە پەیوەسـت بـوو ئـارامی گـرت ٥ دوای دەوڵەمەنـدی هـەژار كەوت.

أرْكَعَهُ: وای لـێ کـرد بچۆمێتەوە ٥ مـل كەچ بێ.

تَرَكَّعَ: نوێژی کرد.

**ألرُّكعَةُ**: ركاتە نوێژێك ٥ چونە روكوع ٥ هەموو راوەستانێك بۆ خوێندنی فاتیحەو چونە روكوعو چونە سوژدە.

**الرُّكوع في الصلاة**: ئەوەیە نوێژكەر دوای خوێندنی فاتیحە خۆی بچۆمێنێتەوە تا بەری دەستی دەگاتە كەشكە ئەژنۆیو پشتی تەخت بوەستێ.

**إرْتَكَفَ الثلجُ**: بەفرباریو لەزەوی دا مایەوە.

**الرُّكَفَةُ**: بنكی درەختی بخوری مەریەم.

**رَكَّ الشَّيْءُ رَكًّا وركاكةً**: شتەكە لاواز بوو بارێك بوو، دەگوترێ: (إقطعه من حيث رَكَّ).

**رَكَّ الغُلُّ في عنقه رَكّاً**: چروكو دەست قوچاو بوو.

**رَكَّ الشَّيْءَ بيده**: شتەكەی ئەمدیوو ئەو دیو كرد بۆئەوەی بزانێ قەبارەی چەندە.

**رَكَّ الأمْرَ**: شتەكانی سواری یەك كردن.

**رَكَّ السِّقاءَ**: كوندە مەشكەكەی پینەكرد.

**أرَكَّت السماءُ**: ئاسمان بارانێكی كەمی باراند.

**أرَكَّتِ الأرضَ**: بارانێكی كەمی لە زەوی دا.

**رَكَّكت السماءُ**: بەمانا (أرَكَّتْ)دێ.

**إرْتَكَّ**: كەم بوو، لاواز بوو، كەوتە گومانەوە.

**اِسْتَرَكَّ**: بەلاوازی لەقەڵەم دا.

**الأرَكّ**: ئادەمیزادی ڕەزیلو لاواز لەعەقڵو ڕادا.

**الرُّكّاك**: بەمانا (الأرَكّ)دێ.

**الرُّكّاكَةُ**: پیاوێك ئافرەت شەرمی لێ نەكەنو ڕێزی نەگرن ٥ پیاوی خوێڕیو بێ غیرەتو خێزان بەرەڵلا ٥ ژنەكەی داوێن پیس بێو لەی بێدەنگ بێ.

**الرِّكُّ**: بارانی كەم ٥ (ك: أركاك، ركاك).

**الرُّكِّي**: دەگوترێ: (شحمة الرُّكِّيّ): بەزێك زوو بتوێتەوە.

**الرُّكيك**: لاواز ٥ كەم ٥ دەگوترێ: (هو ركيك العلم): ئەو كەسە زانیاری كەمە ٥ (ركيك الأسلوب): ئوسلوبی نارێكو پێكە ٥ (ركيك العقل): كەم عەقڵە.

**الرُّكيكة**: مێینەی (الركيك).

**الرُّك**: زەوییەك بارانی كەمی لێ باریبێ.

**المُرْتَكّ**: كەسێك قسەزانو زمان ڕەوان بێ بەتەنها بەلام لەكاتی بەرامبەریو موجادەلەدا قسەی بۆنەكرێ ٥ (سكران مرتك): سەرخۆشێكە دەمی تێكەڵو پێكەڵ دەبێ.

**رَكَلَهُ رَكْلاً**: لینگەژەنەی کرد.

**راكلـه**: هەریەکە لەودوکەسە قاچیان لێکەوەژنی.

**تراكلـوا**: هەرکەسە لەعاست خۆیەوە لینگە ژەنەی لەگەڵ ئەوی ترکرد.

**تركل بمجرفته**: قاچی بەپێمەڕەکەدا دا بۆئەوەی لەزەوی بچەقێ.

**المَرْكَـلُ**: ڕێگا ○ لەولاخیش بەو شوێنەی دەگوترێ کە سوار لەکاتی هەڵینگ دانی دا ئاوزەنگی لێ دەدا.

**رَكَمَهُ رَكْماً**: شتەکەی کۆکردەوە خستیە سەریەك.

**إرْتَكَمَ**: کۆ بۆوە هێندێکی کەوتە سەر هەندێکی.

**تَراكَمَ**: بەمانا (إرْتَكَمَ) دێ، دەگوترێ: (تراكمت الأشغال): کارەکان کەوتنە سەریەكو کۆبوونەوە.

**الرُكـامُ**: شتی کۆبۆوەو بەسەریەکدا کەوتوو، کۆمەڵە شت ○ دەگوترێ: (ركام من رمل) و(ركام من سحاب).

**الـرُكَمُ**: هەوری گەواڵ گەواڵو بەسەریەکدا کەوتوو.

**الرُكمةُ**: قوڕو گڵی کۆمەڵ بوو.

**مُرْتَكَمُ الطريق**: ناوەڕاستی ڕێگا.

**رَكَنَ اليه ركناً وركوناً**: مەیلی بۆلاکردو خۆی پاڵداو جێگیر بوو پشتی پێ بەست.

**رَكِنَ اليه ركنا و ركوناً**: بەمانا (رَكَنَ)دێ.

**رَكِنَ في المنزل ركناً**: لەخانوەکەدا جێگیر بوو جێی نەهێشت.

**رَكُنَ ركانةً وركانيةً وركونةً**: عاقڵ بوو وێڵو وسوڵی نواند.

**تَرَكَّنَ**: ڕەق بوو، پتەو بوو.

**الأَرْكونُ**: سەرۆکی گوند ○ کوێخای دێ.

**الـرُكْنُ**: پایەو سوچ ○ بەشێك لەبەشەکانی حەقیقەتی شت ○ دەگوترێ: (ركن الصلاة وركن الحج ....) ○ کاری گەورە ○ هەرشتێك ببێتە هۆی بەهێز بوونی دەسەڵاتو فەرمانڕەوایی ○ دەشگوترێ: (فلان ركن من أركان قومه): فلانکەس یەکێکە لەپیاو ماقوڵانی تایەفەو هۆزەکەی ○ لەیاسای عەسکەری دا بەئەفسەرێك دەگوترێ لەزانیاری سەربازی دا لێهاتوویی هەبێ ○ هەروا ناوە بۆ جێگیری فەرمانڕەوای عەسکەر ○ (ك: أركان وركون).

**المِركَنُ**: مەرکانەو سوێنەی جل تێدا شۆرین.

**رَكَا عَلَى فلان رَكْواً**: هەواڵی ناخۆشی بەگوێی فلان دا دا ○ یان بە قسەی ناشیرین دەری کرد.

**رَكَا بالمكان بقية يومه**: لەوشوێنە مایەوە.

**رَكَا فلان**: حەوزێکی لاکێشەیی هەڵکەند.
**رَكَا الأرض**: زەوییەکەی هەڵکەند.
**رَكَا الحَوْضَ**: حەوزەکەی پڕکردەوە.
**رَكَا الأمْرَ**: کارەکەی چاك کردو پتەوی کرد.
**رَكَا عليه الحِملَ**: بارەکەی لێ قورس کرد.
**أركى على فلان**: بەمانا (ركا)دێ.
**أركى عليه الحِمْلَ**: بەمانا (رکاه) دێ.
**أركى اليه**: پەنای بۆ برد.
**أركى لهم جنداً**: سەربازی بۆ ئامادەکردن.
**أركى في الأمر**: لەکارەکەدا دواکەوت.
**أركى الأمرَ**: کارەکەی دواخست.
**إرْتكى عليه**: پشتی پێ بەست ٥ قورسایی خستە سەر ئەو.
**الرُكوَةُ**: قاپێك یان دۆڵچەیەکی بچوکە لەپێست دروست دەکرێ ئاوی پێ دەخورێتەوە ٥ یان ئاوی پێ هەڵدەهێنجرێ ٥ (ك: أركاة).
**الرَكِيَةُ**: بیرێك هەڵنەچنرابێ ٥ (ك: ركايا).
**المَرْكوُ**: حەوز.
**رَمَأ** بالمكان رَمْوءَ: لەو شوێنە مایەوە.
**رَمَأ الشَيْئُ** على كذا: ئەو شتە لە وەزیاد بوو.
**رَمَأ الخَبَرَ**: گومانی بۆ هەواڵەکە چو، مەزندەی کرد، دەشگوترێ: (هل رَمَأ اليك خبر).
**مُرْمَآت الأخبار**: هەواڵی ئەفسانە ئامێز.
**رَمَثَهُ رَمْثاً**: بەدەستی مەسحی کرد، چاکی کردەوە.
**رَمَثَ الشَيْئَ بالشَيْئِ**: ئەوشتەی بەوشتە تێکەڵاو کرد.
**رَمَثَ الشَيْئَ رَمْثاً**: شتەکەی دزی.
**رَمِثَ أمرُهُمْ رَمَثاً**: کارەکەیان تێکەڵو پێکەڵ بوو.
**رَمَثَ الإبلُ**: حوشترەکە گیای (رمث)خوارد سکی ئێشا.
**رَمَثَ**: گیا ترشۆکەیە لەولاتی شام زۆر دەروی.
**أرْمَثَ في مالە**: هەندێ لەماڵەکەی هێشتەوە.
**أرْمَثَ الشَيْئَ**: شتەکەی زیاد کرد ٥ شلی کرد، نەرمی کرد.
**رَمَّثَ على كذا**: لەوەی زیاد کرد ٥ دەگوترێ: (رَمَّث على الخمسين): لە پەنجا تێپەڕی.
**رَمَّثت غنمه على المائة**: مەڕەکەی لەسەد زیاد بوون.
**رَمَّثَ الشَيْئَ**: شتەکەی چاك کردەوە.
**استَرْمَثَ في مالە**: بەمانا (أرمث)دێ. ٥
**الرِّمْث**: پیاوی جل شڕو چڵکن ٥ پشت باریك ٥ گیایەکی کێوییە لەگیا

ترشەکانە بەزۆری لە چۆڵەوانی شام دەڕوێ ٥ داری کەڵەکی سەرئاوو بەلەم، یان کوندەی ژێر کەڵەکی سەرئاو ٥ حەبلی ڕزیو ٥ پاشماوەی شیر لەگوانی حەیوانی شیر دەردا.

**اَلْمَرْمَثَةُ**: (أرض مرمَثَةٌ): زەوییەکە زۆر گیا ترشەی تێدا دەڕوێ.

**رَمَجَ** الطائر رَمْجاً: باڵندەکە چیقنەی کرد.

**رَمَّجَ ما كتب من السطور**: ئەو خەتانەی نوسیبوونی ڕەشی کردنەوە.

**الرَّامِجُ**: کوندەبەبوو قاچی دەبەستنەوە لای تەڵەو فاقە بۆ ئەوەی حەیوانو باڵندەی زینە خرۆی پێ بگرن.

**الرَّمَاجُ**: پشتی ڕمبو لولەی ڕمب.

**رَمَحَ** البرقُ رَمْحاً: بروسکەکە بەگزی دەرکەوت، شۆقی زۆر نەبوو.

**رَمَحَ** فلاناً: ڕمبی لەفلان دا.

**رَمَحَتْ الدابةُ فلاناً رَمْحاً ورماحاً**: وڵاخەکە لوشکی لەفلان دا.

**رَامَحَهُ**: بەڕمب لێی دا.

**تَرَامَحُوا**: بەڕمب لێکیان دا.

**الرَّامِحُ**: خاوەن ڕمب ٥ (ثور رامح): کەڵەگای دوشاخ ٥ (السماك الرامح): ئەستێرەیەکە لەپێشیەوە ئەستێرەیەکی تر هەیە روناکیەکەی درێژ دەنوێنی.

**الرِّماحُ**: (رماح الجن): پەتاو تاعون ٥ (رماح العقرب): چزوی دوپشك.

**الرِّماحَةُ**: پیشەی ڕمب دروستکردن (شیرگەر).

**الرُّمْحُ**: ئاسنێکە لای سەروی تیژە بۆ برینداركردن ٥ هەروا ناوە بۆ دەستە دوی نامێری جوتیاریی ٥ (ك: رماح وأرماح) ٥ هەروا دەگوترێ: (كَسَرُوا بينهم رمحاً): واتە شەڕو هەرا کەوتە ناویانەوە ٥ (وهم على بني فلان رمح واحد): ئەوانە لەناو خۆیان دا یەکیەتییان هەیە.

**الرَّمَّاحُ**: ڕمب دروستکەر ٥ ئەو کەسەی ڕمب بەدەستەوە دەگرێ.

**الرَّمَّاحَةُ**: ئەو کەوانەیە زۆر توندبێو هاویشتنی بەهێز بێ.

**الرَّمُوحُ من الدواب**: ئەو حەیوانەیە کەشت دەگەزێ.

**الرُّمَيْحُ**: عەصاو گۆچان کەپیاوی پیرو ژنی پیر خۆی بەسەردا دەدەن.

**أَرْمَخَ النخلُ**: دارخورماکە بەرسیلەی کرد.

**أَرْمَخَ فلان**: فلانکەس نەرم بوو، ملکەچ بوو.

**أَرْمَخَتْ الدابَّةُ**: ئاژەڵەکە پیر بوو یان قەڵەو بوو.

**الرِّمْخُ**: درەختی کۆبوەو تێکچرژاو.

الـرِّمَغُ: بەرسیلەی خورما ٥ خورمـای کاڵو نەگەییو.

رَمَـدَ رَمْـداً ورِمـادةً: فـەوتاو بـوو بەخۆڵەمێش.

رَمَدَ الشَّيْءَ: شتەکەی لەناو برد.

رَمِدَ رَمَداً ورُمْدَةً: رەنگی خاکی بوو.

رَمَدَتْ العَيْنُ رماداً: چاوەکە هێشا زانی تێکەوت بەگرێ وەستا ٥ دەگوترێ: (رَمِدَ فلان) ٥ (هو أرمَدُ وهي رمداء).

أرْمَدَ: فەوتا ٥ هەژار کەوت.

أرْمَـدَ القـومُ: خەڵـکەکە توشـی قـاتو قڕیو هەژاری هاتن.

أرْمَدَ البُكاءُ عينَهُ: گریان چاوی توشی چاو ئێشە کرد.

أرْمَـدَ الـشَّيْءَ: شـتەکەی وەکـوو خوڵەمێش لێ کرد.

رَمَّـدَ الـشَّيْءَ: شـتەکەی خـستە نـاو خۆڵـەوە ٥ وەکـوو خۆڵەمێـشی لێکرد.

رَمَّـدَ الـشواءَ: برژاوەکـەی خـستە نـاو پشکۆ ئاگرەکانەوە.

إرمَدَّ: وەکوو نوعامە بازی دا.

إرمَدَّ وَجْهُهُ: دەمو چاوی رەنگی خـۆڵی گرت.

إرمَدَّت العينُ: چاوەکە هێشا.

الأرْمَـدُ مِـن الثيـاب: پۆشـاکی تـەپو تۆزاوی چڵکن.

الرامِدُ: شتی رزیوو بێ سود.

الرَّمـاد: خـۆڵ ئـەوەی دوا سـوتان لەشـتەکە دەمێنێتـەوە ٥ (کـثیر الرماد): سەخی سروشتو دڵفراوان (کینایـە یـە) ٥ (سُـقِيَ الرمـادُ في وجهه): دەمو چاوی گۆڕا.

الرَّمادة: کۆمەڵە خۆڵ ٥ (عام الرَّمادة): ساڵێـک بـوو لـەزەمانی ئیمـامی عومەردا خەڵـک توشـی قـاتو قـڕی هاتن، ساڵی ١٨ کۆچی بوو.

الرَّمَادِيّ: رەنگ خۆڵاوی (خاکی).

الرَّمَدُ: نەخۆشییەکە توشی چاو دەبێ ٥ (علـم الرَّمَـد): زانیـاری پزیـشکی چاو.

الرَّمِـدُ: رەنـگ لێڵـی کـەوەکوو رەنگـی خـۆڵ بـێ ٥ نـاوی گـەڕاو ٥ پۆشـاکی چڵکن.

الرُّمْدُ: مێشوولە.

الرَّمَدِيّ: پزیشکی چاو.

رَمْـرَمَ الرجـلُ وغـيره: پیاوەکـە خـۆراکی بـەرماوەو پـرت بـڵاوی داکـەوتوو لەمێزو سفرەی کەسانی تـر خـوارد، بێـزی لـەپیس بـوونی نـەکردەوە ٥ لەحـەدیـث دا هـاتووە دەفـەرموێ: (دخلـت امـرأة في هـرة حَبَـسَتْها فـلا أطعمها ولا أرسلتها ترمرِمُ من خشاش الأرض).

تَرَمْرَمَ: دەمی جوڵاند قسە بکا قسەی نەکرد ◦ دەگوترێ: (کلمته فما ترمرم بحرف).

تَرَمْرَمَ الشَّيْئُ: شتەکە پرژو بڵاو بۆوە.

الرِّمْرامُ: پوش‌و پاڵی بەهار.

رَمَزَ اليه رمزاً: لێوی لێ بادا، چاوی لێ داگرت بڕۆی لێ هەڵتەکاند ◦ بەلێو یان بەچاو یان بڕۆ ئیشارەتی بۆ کرد.

رَمَزَ الظَّبْيُ رَمَزَاناً: ئاسکەکە بازی هاویشت.

رَمَزَ إلى الشَّيْئِ بكذا: بەوشتە شارەزای کرد بۆی.

رَمَزَ فلاناً بكذا: فلانکەسی بەوشتە هەڵخەڵاتاند.

رَمَزَ رمازة: وێك هاتەوە ◦ جم‌وجۆڵی زۆر بوو، عاقڵ‌و ئاغر بوو، شکۆمەند بوو، ڕەسەن بوو.

رَمَزَ فؤاده: دڵی تەنگ بوو.

ترامزوا: هەریەکەیان ئیشارەی بۆ ئەوی تر کرد.

تَرَمَّزَ: جم‌و جۆڵی کردو کەوتە شەقەتۆڵە، دەگوترێ: (تَرَمَّزَ من الضربة): بەلێدانەکە کەوتە جم‌و جۆڵ.

ترمَّزُوا: خەڵکەکە لەکوڕەکەیان دا کەوتنە جم‌و جۆڵ‌و تێك خرۆشان ◦ خۆیان ئامادەکرد بۆ جم‌و جۆڵ‌و ڕاپەڕین.

إرْتَمَزَ: بەمانا (تَرَمَّزَ)دێ.

الرَّامِزَةُ: بەزێکە لەئەژنۆدا دەبێ.

الرَّمْزُ: ئاماژەو تیل نیشان ◦ نیشانەو دیاردە ◦ لەزارەوەی (علم البيان)دا کینایەی شاردراوەیە ◦ (ك: رُمُوز).

الرُّمْزُ: ئاماژەو تیل نیشان.

الرُّمُزُ: بەمانا (الرُّمْزُ)دێ.

الرَّمْزِيَّةُ: ڕێبازی ڕەمزی، ڕێبازێکی ئەدەبی‌و فەننییە لەشیعردا سەری هەڵدا.

الرَّمَّازَةُ: ئافرەتی بەدڕەوشت کە بەئیشارە پیاوی بێگانە بۆلای خۆی کێش دەکا ◦ (کتيبة رمّازة): پەلە پێشمەرگەو کۆمەڵە سەربازە کەلەبەر زۆرییان هەرتێکەوە دەهاون.

رَمَسَ الميتَ: مردووەکەی بەخاك سپار لەگۆڕی ناو گڵی بەسەردا کرد سەرقەبرەکەی کۆتاییەوە.

رَمَسَ الشَّيْئَ: شوێنەواری شتەکەی کوژاندەوە، دەگوترێ: (الرِّيحُ ترمسُ الآثار): ڕەشەبایەکە شوێنەوارەکانی داپۆشین، گڵ‌و خۆڵی بەسەردا کردن.

رَمَسَ القَبْرَ: گۆڕەکەی لەگەڵ زەوی دا تەخت کرد.

رَمَسَ عليه الخَبَرَ: هەواڵەکەی لێ شاردەوە.
رَمَسَ فلاناً بحجر: بەردی گرتە فلانکەس.
أرْمَسَ الميت: بەمانا (رَمَسَهُ)دێ.
إرْتَمَسَ في الماء: خۆی لەئاوەکەدا نقوم کرد تا سەری چووە ژێر ئاوەکە.
الرّامُوسُ: گۆڕ ٥ (ك: رواميس).
الـرّمِسُ: باڵنـدە ٥ پەلـەوەر ٥ دەعبـای شەوگەڕ وەکوو شەمشەمە کوێرە ٥ (ك: روامِسُ).
الرّامِسَةُ: بایەکی بـەهێز کەگڵو خۆڵ هەڵبگرێو شوێنەوار داپۆشی ٥ (ك: روامس).
الرَّمْسُ: گۆڕێـك لەگەڵ زەوی دا تەخت بووبـێ ٥ ئـەو گڵـەی دەکرێتـە نـاو گۆڕەوەو مردوەکەی پێ دادەپۆشرێ ٥ (ك: رموس وأرماس).
اَلْمَـرْمَسُ: شـوێنی گـۆڕ هەڵـکەندن، گورستان.
المَرْمُوسَةُ: دەگوترێ: (وقعوا في مرموسـة من أمرهم): خەڵکەکە کەوتنـە مقـۆ مقـــۆو تێـــکەڵو پێـــکەڵیەوە لەئیشەکەیان دا ٥
رَمَـشَ الـشّيَ رَمْـشاً: بەسـەری پەنجـەی شتەکەی گرت ٥ دەستی لـێ دا.
رَمَـشَ فلانـاً بحجـر: بـەردی لەفلانکـەس گرت.
رمِــشَتْ عَيْنَــهُ رَمَـشاً: پێڵـوی چـاوی ســـوربونو برژانگـــی پێـــکەوە نووســانو چــاوی ئاویــان لــێهات، دەگوتـرێ: (رَمِـشَ فـلان، هـو أرمـش وهي رَمْشاء).
أرْمَــشَ الـشجرُ: درەختەکـە پـشکوتو گەڵای کرد.
أرمش فلان: بەمانا (رَمَشَ) دێ ٥ چاوی زۆر تروکاندن لەبەر زەعیفی چاوی ٥ چاوی تێـکچون پێڵوەکـانی چـاك نەبوونەوە.
الــرُمْشُ: ســپیایەتیە کەلــە نینــۆکی منداڵ دا دەردەکەوێ.
المِرْمَاشُ: ئەوکەسەی لـەکاتی روانـین دا زۆر چـــاوی بتروکێنـــێ ٥ (ك: مراميش).
اَلْمُــرَمَّشُ: ئەوکەســەی پێڵـوی چـاوی توشـــی نەخۆشـــی بـــوبنو چـــاك نەبنەوە.
رَمَـصَتِ الدُجاجـةُ رَمْـصاً: مریـشکەکە جیقنەی کرد.
رَمَصَ فلان لأهله: فلان کاسبی بۆ خێزانی خۆی کرد.
رَمَــصَ بــين القــوم: لــەناو خەڵــکەکەدا ئاشتەوایی‌و چاکسازی بڵاو کردەوە.
رَمَــصَ الله مُــصيبَتَهُ: خــودا پاداشــتی کۆسـتەکەی دایـەوە ٥ خەسـاری بـۆ پڕکردەوە.

رَمِصَ الشَّيْءَ: داوای شتەکەی کرد ◦ دەستی لێ دا.

رمِصَت العين رَمَصاً: چڵك و ڕیپۆقی سپی لە قولینچکی چاوی دا کۆبوەوە ◦ دەگوترێ: (هو أرمَص وهي رمصاء) ◦ (ك: رُمْصٌ).

أرمَصَهُ الرَّمَدُ: چاوهێشە پێڵوی چاوەکانی تێك دان.

الرَّمَصُ: چڵکێکی سپی ڕەقە لە قلینچکی چاوی دا کۆدەبێتەوە.

رَمَضَ النَّصْلَ رمضاً: سەرە تیرەکەی تیژ کرد.

رَمَضَ الشَّاةَ: مەڕەکەی کەوڵ کردو پێستەکەی بەسەردا دایەوە ◦ خستیە سەر بەردی گەرم بوو، ئاگری لەسەر کردەوە بۆئەوەی پێ بگاو بەکەڵکی خواردن بێ ◦

رَمَضَ الراعي مواشِيَهُ: شوانەکە لە لمبەلانو گەرمە سێردا ئاژەڵەکانی لەوەڕاندن.

رُمِضَ فلان: فلانکەس لمبی گەرم قاچی سوتاندن.

رَمِضَ رَمَضاً: بەلمبی گەرم دا ڕۆیشت.

رَمِضَ الشَّيْءَ: شتەکە گەرمی زۆر بوو، دەگوترێ: (رمِضَتِ الأرضُ): زەوییەکە بەهۆی چڕبوونەوەی تیشکی خۆر بۆسەری زۆر گەرم بوو

◦ (رَمِضَ اليوم): ڕۆژەکە ڕۆژێکی گەرم بوو ◦ (رمِضَ الصائم): ڕۆژوەوانەکە ناوسکی گەرم داهات لەتینوان ◦ (رمضت قدمه): قاچی بەلمبی گەرم سوتان.

رَمِضَ الغَنَمُ: ئاژەڵەکان لەچرقەی گەرمادا لەوەڕانو جەرگیان توشی نەخۆشی بوو.

رَمِضَ للأمر: لەڕقان جەرگی بۆ سوتا ◦ داخ لەدڵ بوو بۆی.

أرْمَضَهُ الحَرُّ: گەرما هەڵی پرووکاند.

أرْمَضَ الشَّيْءُ فلاناً: شتەکە فلانکەسی داخ کرد.

أرْمَضَ النصْلَ: سەرەتیرەکەی تیژ کردن.

أرْمَضَ الراعي مواشِيَهُ: لەگەرمە سێرو لمبەلان دا شوانەکە مەڕەکانی لەوەڕاندن.

رَمَّضَهُ: کەمێك چاوەڕوانی کردو دوایی ڕۆیشت.

رَمَّضَ الراعي مواشيه: بەمانا (رَمَضَها)دێ.

رَمَّضَ الصَّوْمَ: نیەتی ڕۆژوی هێنا.

إرتمض من كذا: لەوشتە جاڕز بوو لەسەر شانی گران بوو.

إرْتَمَضَ لە: پەرۆشی بوو ◦ جەرگی داڕزا.

أرْتَمَضَ الفَرَسُ بـه: ئەسپەكە بازی پـێ دا.
تَرمَّضتْ نفسُهُ: دەروونـی تێـك چـوو، نەفسی لاواز بوو.
تَرَمَّضَ الصَّيْدَ: نێـچیرەكەی راوكـرد لـە لمبـەلآنو گـەرما دا، واتـە: رێـی كـەوتو لـەقاقوزەی پێـچا تـا خزاندییـە نـاو لمبـەلآنو قاچـی لـە لمبەكـە چـەقینو برسـتی لـی بـڕاو گرتی.
الرَّمْضَاءُ: گـەرمای بـەهێز ٥ جەنگـەی گـەرما ٥ زەوییـەك كـە راسـتەوخۆ خۆر لـێی بداو سوور بوبێتەوە.
رمـضان: مـانگی نۆیـەمی سـاڵی قەمەرییـە ٥ (ك: رمـضانات، رماضين).
الـرَّمَضُ: بـارانی پـێش وەرزی پـاییز كەزەوی گەرمو سۆتەمەڕۆیە.
الرَّمَـضِيّ: هـەورو بـارانی كۆتـایی هاوینو سەرەتای وەرزی پایز.
الْمَـرْمِضُ: پـاوان شـوێنی لـەوەڕانی ئاژەڵ.
رَمَطَهُ رَمْطاً: رەخنەی لـێ گرتو تانەی لـێ دا.
رَمَـعَ رَمْعـاً ورَمْعانـاً: كەوتـە پەلـە پـەلو هەڵسورو داسوڕ.
رَمَعَ أنفُـهُ: لـەرق هەڵساوییا لوتی كەوتـە لەرزە ٥ یان بە خێرایی كەوتـە ڕێو ڕۆیشت.
رَمَعَتِ الأُمُّ بولدها: دایكەكە منداڵەكەی بەنەكاملی بوو.
رُمِعَ: نەخۆشی توشی پشتی ئاو فرۆشەكە بوو لەرۆیشتن كەوت.
رَمَعَ: بەمانا (رُمِعَ) هاتووە.
أرْمَعَ: بەمانا (رُمِعَ)هاتووە.
رَمَّعَـتِ الـسِّبَاعُ: درنـدەكان بێـچوویان بوون بەنەكاملی.
رُمِّعَ: بەمانا (رُمِعَ) هاتووە.
تَرَمَّـعَ: كەوتـە جـەو جوڵو شـڵەژانو هاتوو چۆ، دەگوترێ: (ترمَّعَ أنفه من الغضب).
الرُّماعُ: ئازارێكە توشی پـشتی ئـاوگێڕ (ئـاو فـرۆش)دەبـێ ناتوانـێ ئـاو لەكۆڵنێو بیفرۆشێ ٥ نەخۆشییەكە توشی گەدە دەبێو لـەناكام دا دەمو چاوی زەرد هەڵدەگەڕێن.
الرُّمْعَةُ: كۆمەڵە رووەكێك، باقە گیایەك ٥ دەسكێك گوڵو رێحانە.
الرُّمَاعـَةُ: پـشت مەلآشـوی منـداڵ كەلەبـەر تـەنكیو زەعیفـی جـەو جوڵ دەكا.
اليَرْمَعُ: مزراحە قۆڕ قۆڕەی منداڵ كە دایدەخوتێ دەنگی لـێ دێ ٥ بـەردە سـیخرۆ كەلەبـەر تیـشكی خـۆردا دەدرەوشێتەوە.

**اِرْمَعَلَّ**: فرمێسکی بێ وەستان هاتنە خوار دڵۆپ دڵۆپ هەڵڕژان ◊ (اِرْمَعَلَّ الصَبِيُّ): منداڵەکە لیکی دێتە خوار (لیکنە) ◊ (اِرْمَعَلَّ الشِّواءُ): گۆشتە برژاوەکە چەورییەکەی داچۆڕا ◊ (اِرمعلّ الثوبُ): کراسەکە تەڕ بوو ◊ (اِرْمَعَلَّ الأَديمُ): چەرمە کەزۆر تەڕ بوو.

**اِرْمَعَلّ الإبل**: حوشترەکان بڵاو بوونەوە ◊ (اِرْمَعَلّ فلان): فلانکەس پەلەی کرد ◊ لرخەو پرخەی لێهات.

**رَمَعَهُ رَمْعاً**: بەدەست شێلای، هەنووی ◊ دەستی پێداهێنا ◊

**رَمَّعَ الطعامَ**: خواردنەکەی بەپێخۆر رازاندەوە ◊ خۆشی کرد ◊ چەوری کرد ◊ چەوریی تێکرد ◊ (رَمَّعَ الكلام): قسەکەی هەڵگێڕایەوە.

**رَمَقَهُ رَمْقاً**: سەیری کرد، دەگوترێ: (رَمَقَهُ ببصره): چاوی تی بڕی ◊ چاوی بەدوو دا گێڕاو چاودێری کرد ◊ چاوەڕوانی بوو.

**رامَقَهُ مرامَقَةً ورماقاً**: بەمانا (رَمَقَهُ) دێ ◊ بەچاوی ڕق‌و قینەوە سەیری کرد. ◊ سازش‌و زەمانە سازیی لەگەڵ کرد ◊ لەترسی ئەوەی زیانی بێ بگەیەنێ لەگەڵی دا هەڵیکرد.

**رامق الأمر**: کارەکەی تەواو نەکرد.

**رَمَّقَهُ**: چاوی تێبڕی‌و سەیری کرد.

**رَمَّقَ في الشَّيْئِ**: زێدەڕەوی لەکارەکەدا نەکردو بەجوانی ئەنجامی نەدا.

**رَمَّقَ الكلامَ**: قسەکانی هەڵبەستن‌و وتەکانی هەڵگێڕانەوە.

**اِرْمَقَّ**: لاوازی کرد ◊ دارزا ◊ (اِرْمَقَّ الجلد): پێستەکە تەنك بوو ◊ (اِرْمَقَّ الطريقُ): ڕێگەکە درێژ بووە.

**تَرَمَّقَ الشّرابَ**: شلەمەنییەکەی وردە وردە خواردەوە.

**الأَرْمَاقُ**: (حبل أرماق): حەبلێکی زەعیف‌و رزیوە.

**الرُّماق**: ژیانی کولە مەرگی.

**الرَّمَقَ**: باقی ماندەی گیان (گیانەلاو).

**الرَّمِقُ**: (عيش رَمِقٌ): ژیانی کولەمەرگی ◊ ژیانێك کەزۆر زبربێ‌و کەم‌و کورتی تێدابێ.

**الرُّمُقُ**: حەسودی ◊ ئەو هەژارانەی دەگەنە ئەوپەڕی پلەی هەژاری.

**الرُّمُقُ**: پیاوی زەعیف‌و لاواز.

**المُرامِقُ**: ئەوکەسەی بەعاستەم هۆکاری ژیانی بۆ بەرجەستە بروبێ ◊ ئەوکەسەی کەمێك خۆشەویستی نەبێ هیچی تری لەدڵ دا نەماوە ◊ ئادەمیزادی ڕەوشت ناشیرین‌و لاواز.

**المُرَمِّقُ من العيش**: کەسێك بەژیانی کولەمەرگی بژیا.

**رَمَكَ** في المكان وبه رموكاً: لەوشوێنە مایەوە جێی نەهێشت.

**رَمَكَ** في الطعام: هیچی لەخواردنەکە نەهێشتەوە هەمووی لرف دا.

**أرْمَكَهُ**: وای لێ کرد لەو شوێنە بمێنێتەوە.

**إرْمَكَّ**: ناسك بوو باریك بوو.

**إرمكَّ الجملُ**: حوشترەکە ڕەنگی خاکی بوو یان زۆر بۆر بوو تاوا دەبیندرا مەیلەو ڕەش بێ ٥ حوشترەکە کزو لاواز بوو.

**استرمَكَ القومُ**: خەڵکەکە گاڵتەیان بەباوكو باپیرانی خۆیان دەکرد.

**الرَّامِكُ**: کەسێك لەشوێنێك نیشتەجێ بێو لێی نەڕوا ٥ جۆرە بۆنێکە ڕەنگەکەی خاکییە.

**الرِّمْكَةُ**: لاواز ٥ ئەسپی بارگیری، تایبەت بکرێ بۆ پەڕین ٥ (ك: رَمَك ورماك).

**الرُّمَكَةُ**: ڕەنگی خاکی یان زۆر لێڵو مەیلەو ڕەش.

**رَمَلَ** رَمَلاً ورَمَلاناً: گورگە لۆقەی کرد.

**رَمَلَ** النَّسجَ رَمْلاً: چنراوەکەی تەنكو سفتو سۆڵ کرد.

**رَمَلَ** السَّريرَ: کورسیو مێزو سیسەمەکەی ڕازاندەوە بەجەواهیرو یاقوت.

**رَمَلَ** الحصيرَ: حەسیرەکەی چنی.

**أرمَلَ المكانُ**: شوێنەکە بوو بەلمبەلان.

**أرْمَلَ فلانٌ**: فلانکەس تێشوی نەماو هەژارو ئاتاج بوو.

**أرملت المرأةُ**: ئافرەتەکە بێوەژن کەوت ٥ مێردی مرد.

**أرْمَلَ الحَبْلَ**: حەبلەکەی درێژ کردەوە.

**أرملَ الحصيرَ**: حەسیرەکەی چنی.

**أرْمَلَ الزادَ**: تێشووەکەی تەواو کرد هیچی نەما.

**رَمَّلَ الطعَامَ**: لمبی کردە ناو خواردنەکەوە بۆ ئەوەی کەڵکی نەمێنێ ٥ لەحەدیثی پێغەمبەر دا دەربارەی (الحمر الوحشية) هاتووە دەڵێ: (وأمر ان تكفأ القدور وأن يُرَمَّلَ اللحمَ بالتراب).

**رَمَّلَ الثوبَ**: خوێنی لەکراسەکە هەڵسو، خوێناوی کرد.

**رَمَّلَ النسيجَ**: چنراوەکەی تەنكو سفت کرد.

**رَمَّلَ الكلام**: قسەکەی بەبێ بناغە داناو پوچی کردەوە.

**رَمَّلَ الكاتبُ خطَّهُ**: نوسەرەکە دوای نوسینی لاپەڕەکە لمبی بەسەردا بڵاو کردەوە بۆئەوەی مەرەکەبە زیادەکە هەڵمژێ.

**اِرْتَمَلَ بالدَّم**: بەخوێن چڵکن بوو، جەستەی خوێناوی بوو.

**تَرَمَّلَ**: بەمانا (إرْتَمَلَ)دێ.

**الأرْمَلُ**: ئاتاج ٥ پیاوێك ژنی نەهێنابێ ٥ ژنێك مێردی مردبێ ٥ پێشی دەگوترێ: (أرملة) ٥ (ك: أرامِل وأراملة) ٥ هەروا ناوە بۆ ساڵی کەم باران و بێ پیت ٥ مەڕێك قاچەکانی رەش بن و باقی جەستەی سپی بێ ٥ (ك: رُمْلٌ).

**الرُّمالُ**: شتی چندراو.

**أم رمال**: کەمتیار.

**الرَّمْلُ**: بەردە وردە، لمبو زیخ ٥ (ك: رِمَالٌ) ٥ (علم الرّمل): زانیارییەکە باسی شتی نەزانراو دەکا، زانیارییەکی بێ بناغەیەو خورافەو ئەفسانەیە.

**الرَّمَلُ**: بارانی کەم و نم نم ٥ (ك: أرمال) ٥ یەکێکیشە لە بەحرەکانی شیعری عورووزی ٥ (بحر الرَّمَلْ): (فاعلاتن، فاعلاتن، فاعلن).

**الرملاء**: ساڵی کەم باران و بێ پیت ٥ مەڕی قاچ رەش و خوری سپی ٥ واتە: هەموو جەستەی سپی و قاچی رەش.

**الرَّمْلِيُّ**: گیایەك لەناو لمبەلان دا بڕوێ.

**الرَّمّالُ**: کەسێکە خەریکی زانیاری رەمل بێ.

**المَرْمَلُ**: زنجیری بچوك.

**المَرْمَلَةُ**: ئەوەیە لمبی تێدەکرێ بۆئەوەی نووسراوە تازەکە وشك بکاتەوە.

**رمَّ العَظْمُ رمّاً ورِمَّةً ورميماً**: ئێسقانەکە رزی ٥ دەگوترێ: (رمَّ الميتُ): مردوەکە ڕزی ٥ (رَمَّ الحَبْلُ): گوریسەکە بچڕا.

**رَمَّ الشّيْءَ رمّاً ومَرَمَّةً**: شتەکەی چاك کردەوە هەندێکی لێ ڕزی بوو بێکەڵك بوو بوو ٥ (رمّ المنزلَ): خانوەکەی نوێ کردەوە روخاوو درزی چاك کردنەوە.

**رمّ الشّيْءَ**: شتەکەی خوارد، (رمّ الشاة الحشيش): مەڕەکە گیاو گژەکەی خوارد، بەدوو لیچی گرتی.

**أرَمَّ العَظْمُ**: بەمانا (رمَّ)دێ ٥ (أرَمَّ الميتَ): بەمانا (رمّ)دێ ٥ لەپەندی پێشینان دا هاتووە دەربارەی مەڕی لات و لاواز دەڵێ: (ما يَرِمُّ منها مضرب): ئەگەر ئێسقانی بشکێنی مۆخی تێدا نییە.

**رَمَّمَهُ**: بەمانا (رَمَّهُ)دێ.

**إرْتَمت الشاةُ الحشيشَ**: مەڕەکە بەدوو لیچی گیایەکەی گرت.

**تَرمَّمَتْ العَظْمَ**: ئێسقانەکەی کڕاندەوە هەرچی گۆشتی لەسەری بوو بەددان لێی کردەوە.

تَـرَمَّمَ الـشَّيْئَ: چاكسازى لەشـتەكەدا كردو كونو كەلەبەرى پڕكردنەوە.

إسْتَرَمَّ الشَّيْئَ: شتەكە كاتى ئەوەى هات نۆژەن بكرێتەوە، دەگوترێ: (اسْتَرَمَّ الجـدارُ): ديوارەكـە پێويـستى بـە نۆژەن كردنەوە هەيە.

الأرمـام: (حبـل الأرمـام): حەبلێـكى كۆنو ڕزيوە.

الترمـيم: لـەزاراوەى رەسـمو وێنـەدا بريتيە لەدانانى وەرەقەيـەكى رونو نايلۆن ئاسا لەسەر ئەو ڕەسمـەى كە دەخـوازێ بكوێزرێتـەوە، بـەم جۆرە قەڵەم دێنێ بەسەر خەتە ديارەكانى رەسمەكـــەدا كەلــەژێر وەرەقـــە رونەكەوەيە تا بەتـەواوى وێنەكـەى ژێرەوە دەخاتەسەر وەرەقە رونەكە.

الرِّمام: (حبل رِمَـامٌ): حەبلێـكى كۆنو ڕزيوە.

الرُمامُ: (حبـل رُمـامٌ): حـەبلى ڕزيـوە ٥ ڕوەكى پاقلە پاش پاككردنى.

الرُمامَـــة: ژيـــانى خـــۆشو بـــەناز پەروەردە.

الرِمامُ: زەوى، خاك ٥ مۆخى ئێسقان ٥ ئەو پوشو پەڵاشو خشتو خۆڵەى بـا هەڵيـدەگرێ ٥ ئـەو پـرژو پـاڵو خشتو خۆڵەى لافاو لەگەڵ خۆى دەيهێنێ.

الرُمُّ: غەمو پەژارە.

الرِّمَّـــاء: (نعجـــة رمَّـــاءُ): مەڕێـــكە بەكرمنگ.

الرَّمَّـامُ: ئـەو چـلێسو گەنـدە خۆرەيـە كـە گـوێ ناداتـە پـاكو پيـسىو هەرچى دەستى كەوێ دەيماشێتەوە.

الرُمَّـةُ: پارچـەيەك لەحـەبلى ڕزيـو ٥ (ك: رَمٌّ، رُمَمٌ، ورِمَامٌ) ٥ ئەو حەبلەى دەكرێتـە ملـى حوشـتر ٥ هـەر لـەم ڕووەوە دەگـوترێ: (أعطـاه الـشَّيْئَ برمتـه): واتـە هـەموو شـتەكەى پـێ بەخشى.

الرِّمَّـةُ: بـەمانا (الرُمَّـةُ) دێ ٥ ئێـسقانى ڕزيـو ٥ خـم خۆركـەو مۆرانـە ٥ مێروى باڵدار ٥ (ك: رِمَمٌ ورمام).

الرَّمِيمُ: هەرشتێك ڕزى بێ.

الْمَرَمَّةُ: شتو مەكى ناو ماڵ.

الرُمَّان: هەنار ٥ (رمانـة القبـان): تۆپـە قەپان.

رُمّان الأنهار: ڕوەكێكە گوڵێكى زەردى مەيلەو سوورى هەيـە ٥ دەنكەكـەى لەدەنكى ترشە سماق دەچێ بەزۆرى بـۆ دەرمـان بـەكار دەهێنـدرێ بـۆ نەخۆشى جومگەو نەخۆشى (عرق النـساء) ٥ (رمانـة الدابـة): نـاوەوەى ئاخورى وڵاخ.

الْمَرْمنَـــة: زەوييـــەك زۆرى درەختـــى هەنار لـێ بێ.

رَمِهَ اليومُ رَمَهاً: ڕۆژەكـەى زۆر گـەرم بـوو.

**رَمى الشَّيءُ رماءً:** شتەکە زیادی کرد، گەشەو نمای کرد ٥ تێپەڕی: دەگوترێ: (رمى على الخمسين من عمره): تەمەنی لەپەنجا تێپەڕی ٥ (هو يرمى على صاحبه): ئەو لە هاوەڵەکەی بەتەمەن ترە.

**رمى الشَّيءَ وبه:** شتەکەی هاویشت.

**رمى الله لـه:** خودا یارمەتی داو سەری خست.

**رمى الله في يده:** خودا لەدەستی بدا (دوعا کردنە لێی).

**رمى فلاناً بأمر قبيح:** بوختانی بەکابرا کردو کاری ناشیرینی خستە پاڵ.

**رمى بحبله على غاربه:** وازی لێ هێنا، بەرەڵای کرد.

**رمى به على البلد:** باڵادەستی کردو کردی بە فەرمانڕەوای شار.

**رَمى الْبَلَدَ:** چو بۆ ئەو شارە.

**رمى الصيدَ:** شتێکی بۆ نێچیرەکە هەڵدا بیگرێ.

**أرمى الـشَّيْءُ:** شتەکە زیاد بوو، زۆر بوو، دەگوترێ: (أرمى على الخمسين من عمره): تەمەنی لەپەنجا زیاتر بوو.

**أرمى فلان الشَّيْءَ:** فلان شتەکەی هاویشت ٥ (أرماه من يده): فڕێی دا ٥ (أرماه عن فرسه): لەسەر ئەسپەکەی خستیە خوار ٥ (أرمى به البلدُ): وڵات دەری کردو لەخۆی نەگرت.

**رماه مرماةً ورماءً:** هەریەك لەوانە تفەنگی بەوی تریانەوە نا ٥ لەپەندی پێشینان‌دا هاتووە دەڵێ: (قبل الرّماء تملأ الكنائن): پێش تەقەلەیەك کردنو تفەنگ پێکەوەنان رقو قینەکان سەر ڕێژ دەکەن.

**رمى عن قومه:** تێکۆشا بۆ گەلو وڵاتی.

**ارتمى المتناضلان:** دوو ڕقەبەرەکان تەقەیان لەیەکدی کرد.

**ارتمى به البلاد:** وڵات وەدەری نا ٥ (إرتمى الشَّيْءُ): شتەکە زۆر بوو ٥ (إرتمى الصيدَ): تەقەی لەنێچیرەکە کرد.

**ترامى القومُ:** خەڵکەکە هەندێکیان تەقەیان لەهەندێکی تریان کرد.

**ترامى أمره الى الظفر:** کارەکەی سەرەنجام بوو بە سەرکەوتن.

**ترامى الجرح الى الفساد:** برینەکە سەری کێشا بۆ داوەشانو شێرپەنجە.

**ترامى الشَّيْءُ:** شتەکە بەرەو زۆربوون ڕۆیشت.

**ترامى السحاب:** هەورەکان پاڵیان لێك دا.

**ترامى به البلاد:** وڵات وەدەری نا.

**الرِّماء**: ریباو سود ٥ گەشەکردن.

**الرِّمايَةُ**: تفەنگچیەتی.

**الرِّمْي**: تەمەن درێژ.

**الرِّميُّ**: زیادە، زۆر ٥ دەگوترێ: (في هذا رَمِيٌّ على ما سمعت): ئەمە زۆری زیادە لەوەی بیستومە ٥ هەوری پایزانە کەقەترەی بارانەکەی گەورە گەورە بێ ٥ (ك: أرماء وأرمية ورمايا).

**الرِّمْيَـةُ**: یەکجار تفەنگ هاویشتن ٥ لەپەندی پێشینان دا هاتووە دەڵێ: (ربَّ رمية من غير رام): وادەبێ کابرا تفەنگچی نییەو نیشانەکە دەپێکێ.

**الْمَرْمـى**: نیشانەو هەدەف ئەوشتەی تیرەکەی ئاڕاستە دەکرێ ٥ لەیاری تۆپێن دا بەو شوێنە دەگوترێ: تۆپەکەی ئاڕاستە دەکرێ.

**الْمِرْمَاةُ**: تفەنگێکە بچکۆلە ئەشارەزای پێ فێری تفەنگچێتی دەکرێ ٥ سمی بزن‌و مەڕ.

**الإرْنَبُ**: کەروێشك.

**الْمُؤَرْنَبَةَ**: زەوییەك کەروێشکی زۆر بێ.

**الرَّنْجَـةُ**: جۆرە ماسییەکە خوێی پی دەکرێ‌و وشك دەکرێ‌و هەڵدەگیرێ.

**رَنَّـحَ فـلان**: فلانکەس بەهۆی سەر خۆشییەوە لارە لاریەتی ٥ هەر دەڕواو بەلادا دێ.

**رَنَّحَ الشرابُ فلاناً**: شەرابەکە فلانکەسی والێ کردوە گۆدە گۆدییەتی، دەگوترێ: (رَنَّحَت الريحُ الغصنَ): رەشەباکە لقەدارەکەی بۆ ڕاست‌و چەپ هێناو بردی.

**رُنِحَ فلانٌ ورُنِح عليه**: فلانکەس لەهۆش خۆی چوو بێ هێزو لاوازییەك جەستەی داگرت بەهۆی لێدان یان ترس‌و بیم یان سەرخۆشی.

**تَـرَنَّحَ فـلان**: فلانکەس بەهۆی سەرخۆشی لارە لاریەتی.

**تَرَنَّحَ للشيئ**: بۆ شتەکە راپسکوت بۆی چوو.

**تَرَنَّحَ على فلان**: دەستدرێژی کردە سەر فلان.

**الـرُّنُحُ**: سەرە خولە، سەر سوڕهاتن ٥ موخەیخ کە لەدوا مێشکەوەیە.

**الْمَرْنَحَةُ**: پێشی کەشتی.

**رَنَخَ رُنُوخاً**: پچڕ پچڕ بوو (رَنَّخَهُ) ملکەچ‌و ژێرباری کرد.

**تَرَنَّخَ به**: تەشەببوسی پێ کرد.

**الرَّنْدُ**: درەختێکە بۆنی خۆشە لەپێری (الغاریـة)یـە لـە کەنارەکانی شام‌و وڵاتی غەورو کێوەکانی قەراخ دەریای ئەو وڵاتانە دەڕوێ ٥ روەکی عـود ٥ داری ئـاس‌و زەرفێکی گەورەی وەکوو جەواڵ کە لەپڕۆو پاڵی درەختی خورما دروست بکرێ.

الرِّنــاز: ئینزیمێــکه دەبێتــه هۆکــاری مەیینی شیر.
رَنَعَ الزرعُ رُنوعـاً: کشتوکاڵەکه ئـاوی لـێ براو سیس‌و لاواز بوو.
رَنَعَ لونُهُ: کشتوکاڵەکه ڕەنگی گۆڕاو سیس بوو.
رَنَعَـت الدابـةُ: وڵاخەکـه بەڕاوەشـانی سەری مێشی لەخۆی دەرکرد.
رنع فلان: فلانکەس گاڵتەی کرد.
رَنَـعَ برأسـه: پرسـیاری لـێ کـرا بەسـەر ئاماژەی کرد کەنابێ‌و ڕازی نیم.
رَنَّـعَ رأسَـهُ: سـەری خـۆی بـادا، سـەری لەقاند.
الْمَرْتَعَةُ: دەنگ‌و صەدای نـاو گۆڕەپـانی یاری ٥ هەرزانی‌و پیت‌و بەرەکـەت ٥ بـاغ‌و باغـچه ٥ پارچـەیەك نێـچیر، پارچــه خواردەمەنییــەك، قومــه شەرابێك.
أرْنَفَــت الدابّــةُ بأذنَيْهــا: وڵاخەکــه لەماندویی دا گوێی تەپ کردن.
أرنفـت الـبعيرُ: حوشـترەکه ڕۆیـشت‌و سـەری خـۆی خـسته جـەم‌و جـوڵ‌و ناوچـەوانی پـێش خـست ٥ پەلـەی کرد.
الرانـف: (رانِـفُ كُـلِّ شـيءٍ): قـەراخی شتەکه.
الرَّانِفَـةُ: قـەراخی کرکراگـەی گـوێ ٥ پێستۆکەی نـەرمایی گوێ ٥ کۆتـایی لەپەدەسـت بـەلای قۆڵـەوه ٥ لای خواروی سمت ٥ لا ڕان.
رَنَقَ الماءُ رَنْقـاً ورنوقـاً: ئاوەکـه لـێڵ بـوو ٥ دەگـوترێ: (رَنَــقَ عيــشُهُ): ژیـانی ناخۆش بوو.
رَنِقَ الماءُ رَنَقاً: بەمانا (رَنَقَ)دێ.
أرْنَقَ الماءَ: ئاوەکەی لێڵ کرد.
رَنَّقَ: سەرسـام بـوو ٥ هەسـتاو نـەیزانی بـۆ کـوێ بـچێ نـەیزانی ئـاخۆ دەڕوا یان دێ.
رَنَّقَـت الـسفينةُ: کەشـتییەکه لەشـوێنی خۆی سوڕایەوه نەڕۆی.
رَنَّقَـتْ الرايـةُ: ئاڵاکـه بەسـەر سـەری خەڵکەوه شەکایەوه.
رَنَّقَ الطـائر: باڵندەکه بـاڵی لێـك دان‌و فڕی، خەریك بوو بفڕێ‌و نەفڕی.
رَنَّقَــت الــشمسُ: خــۆر خــەریك بــوو ئاوابێ.
رَنَّــقَ الطــائِرُ: باڵندەکـه بـاڵی شـکان بەنەخۆشی یان بەشتی تـرو کەوتـه خوارەوه.
رَنَّقَتْ عينُهُ: لەبرسا چاوی سپی بوون.
رَنَّــقَ القــومُ بالمكــان: خەڵــکەکه لەوشوێنەمانەوەو گیریان خوارد.
رَنَّــقَ النــومُ عينيــه: خــەو تێــکەڵی چاوەکانی بـووه بـەڵام خـەوی لـی ناکەوێ.
رَنَّــقَ المــاءَ: ئاوەکــەی لــێڵ کــرد.

رَنَّقَ النظرَ: سەیرکردنەکەی شاردەوە ٥ چاوی تێ بڕین‌و چاوی لێ نەگواستەوە.

ترنَّقَ الماءُ: ئاوەکە لێڵ بوو.

الرَّنْقُ: خشت‌و خۆڵی ناو ئاوە ٥ ئاوی لێڵ ٥ درۆ.

الرَّنْقاءَ: پەلەوەری بەکرکەوتوو ٥ زەوی سوتەمەڕۆ.

الرَّنْقَـةُ: ئاوی کەم‌و لێڵ کەلەبنکی حەوزدا دەمێنێتەوە ٥ دەگوترێ: (صار الماءُ رنقة): ئاوەکە قوڕاو بوو.

الرَّوْنَقَ: (رونق السیف): ورشەو بریسکەی شمشێر ٥ جوانی‌و ئاوداری.

رونق الضُّحا: سەرەتای چێشتەنگاو.

رونق الشباب: سەرەتای گەنجی‌و ئاوداری روخسار.

الرَّنْكُ: دروشمی پاشاو فەرمانڕەوا تورکەکان بووە لەمیصر.

رَنِمَ المُغنِّي: گۆرانی بێژەکە دەنگی خۆی لەراندەوە ٥ (هو رَنِمٌ وهي رَنِمَةٌ).

رَنَّمَ: بەمانا (رَنِمَ)دێ ٥ دەگوترێ: (رَنَّمَ الحمامُ والقوس والجندب والعود) ٥ هەرشتێك دەنگی خۆش بێ‌و لەززەت لەدەنگی بکرێ.

ترَنَّمَ: بەمانا (رَنَّمَ)دێ.

الرَّنَمُ: دەنگ‌و ئاواز.

الرَّنَمَةُ: بەمانا (التَّرنُّم) دێ.

الرَّنيمُ: بەمانا (التَّرنم)دێ.

رَنَّ رَنيناً: دەنگی لێ هات ٥ ئاوازی چڕاند ٥ (رَنَّ الیه): گوێی بۆ ڕاگرت.

أرَنَّ: بەمانا (رنَّ)دێ، دەگوترێ: (أرنَّت القوسُ في إنباضها، وأرنَّت المرأة في نَوْحِها، وأرنَّت الحمامة في سجعها، وأرنَّت السحابةُ في رعدها، وأرنَّ الماءُ في خريره).

رَنَّنت المرأةُ ترنيناً: ئافرەتەکە لەرەی بەدەنگی خۆی کرد ٥ بالۆرەی لێ دا ٥ (رَنَّنَ القَوْسَ ونحوه): وای کرد کەوانەکە دەنگی لەرینەوەی لێ بێ.

الرُّنَنُ: ئاوی کەم.

الرُّنَى: بونەوەر ٥ خەڵك ٥ دەگوترێ: (مافي الرّنی مثلهُ).

الرُّنَة: گیانلەبەرێکی گوانداره (شیر دەرو گەڕۆکە) لە پێڕی ئاسکە ٥ هاوار بەدەنگی بەرز ٥ دەنگی غەم‌و پەژاراویی (دەنگی حەزین) لەکاتی گۆرانی گوتن دا، یان لەکاتی گریان دا.

المِرْنان: کەوان ٥ تیری کەوان ٥ ویزەی تیرو گولله ٥ دەگوترێ: (قوس مرنان، سحابة مرنان): تیرێکە ویزە ویزی هەیە، هەورێکە دەگوڵێنی.

رَنَا رَنْواً ورُنُوّاً: چاوی تێ بڕی‌و چاوی لێ نەپاراست ٥ تیلەی چاوی دایە ٥ (رنا

الى حديثه): گوێی بۆ قسەکانی ڕاگرت.
رَنَا عَنه: لێی بێ ئاگا بوو.
رنا فلان: فلان کەوتە کەیفخۆشیو چاوە چاوو عیشقبازیی.
أرناه حُسنُ المنظر: جوانی دیمەنەکە سەرنجی ڕاکێشا بۆ ئەوەی چاوی تێ ببڕێو چاوی لێ نەگوێزێتەوە.
أرناه الى الطاعة: وای لێ کرد هێواش ببێتەوەو دابمرکێ.
رانـــاه: بەســـەری دا بـــەرز بـــووەو شکۆمەندتر بوو لێی ٥ دەگوترێ: (لە شرف يُراني الكواكب): ڕێزو شـــکۆمەندییەکی هەیـــە پـــشت ئەستێرەکان دەکەوێ.
رانا فلاناً: لەگەڵ فلانکەس دا گونجاو هەڵی کرد.
رنَّى: کەیفخۆش بوو، گۆرانی گوت ٥ ناڵاندی.
رنَّى الصوتُ فلاناً: دەنگە خۆشەکە فلانـــی خـــستە کـــەیف خۆشـــیو ڕەقسو سەما.
رنَّى الحسنُ فلانـــاً: جـوانی ئەوشـــتە فلانکەسـی والـــێ کـرد چـاوی لـــێ نەتروکێنێ.
تَرَنَّى: چاوی لەخۆشەویستەکە بڕیو چاوی لێ نەتروکاند.
الرُّنا: ئەوەیە لەبەرجوانییەکەی چاوی لێ نەتروکێندرێ.
الرُّناءُ: جوانیو شۆخو شەنگی.
الرُّنـــاءُ: دەنـــگ، دەنگـــی خـــۆش ٥ (ك: أرنية) ٥ کەیفخۆشی.
الرَّنَّـــاءُ: ئەوکەســـەیە مێبـــازیی دەکـــاو هەمیـــشە ســـەیری ئـــافرەتی جـــوان دەکاو چاویان لێ ناتروکێنی.
الرَّنُونُ: دەگـوترێ: (هـو رَنُـونُ فلانـة): ئـــەو گوێڕایـــەڵی فـــلان ئافرەتـــەو بەدەمو گفتی موعجەبـە ٥ (وهو رَنُوُّ الأمـــاني): ئـــەو کابرایـــە هیوایـــاتی زۆرەو ئاواتەخوازە ئاواتەکانی بێنـە دی یان بەتەمایە بێنە دێ.
رَهِبَهُ رَهَباً ورَهْبَةً ورُهباً: لێی ترسا.
أرهَبَ: قۆڵی پۆشاکەکەی درێـژ بـوو ٥ (أرهَبَ كُمَّهُ): قۆڵی کراسەکەی درێژ کرد.
أرْهَـــبَ فلانـــاً: فلانکەســـی ترســـاند، زەندەقی برد.
رَهَّبَ الجملُ: ڕۆیـشتنی ڕێـگاکە بڕسـتی لەحوشـترەکە بـڕی، لـەکاتی هەڵـسان دا بەلادا هاتو ێیخی خوارد.
رَهَّـــبَ فلانـــاً: فلانکەســـی ترســـاندو زەندەقی برد.
تَرَهَّـبَ الراهـبُ: ڕەبەنەکـە (ڕاهیبەکـە لەخەڵوەتخانەکـەی دا لـــێ بـــڕا بـــۆ خودا پەرستی).

**ترهَّبَ فلان**: فلانكەس خودا پەرستی کرد.

**ترهَّبَ فلاناً**: هەڕەشەی لەفلانکەس کرد.

**اِستْرهَبَهُ**: بەمانا (رَهَّبَهُ) دێ ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَاسْتَرْهَبُوهُمْ وَجَاءُوا بِسِحْرٍ عَظِيمٍ﴾.

**الإرهابيون**: تاقمێکن کە ڕێبازی عونفو توند ڕەوی لەکوشتنو بڕین دا پەیڕەو دەکەن بۆ گەیشتن بە مەرامە سیاسییەکانیان، ڕێگای توندو تیژی دەگرنە بەر.

**الراهِبُ**: ڕەبەنو خەڵوەکێشی مەسیحییەکان کەواز لەدونیاو خزمو خوێش دەهێنێو خۆ تەرخان دەکا بۆ خوداپەرستی لەدێرو ئەشکەوتو پەناو پاساردا ٥ (ك: رهبان ورهابين ورهابنة).

**الراهِبَةُ**: مێینەی (راهب)ە ٥ حاڵو وەزعێکی ترسناك.

**الرُّهابُ**: (رهاب الإحتجاز): لەزاراوەی پزیشکی هەناوی دا ترسە نەخۆشییەکە لەبوون لەشوێنێکی گۆشەگیرو پەنا پەساردا.

**الرَّهابة**: غوضروفێکە وەکوو زوبان لەخوار سینگەوەیە.

**الرُّهابة**: بەمانا (الرَّهابة)دێ.

**الرُّهبُ**: تیری باریك ٥ حوشتری لەڕبوو بەهۆی ماندوو بونی ڕێگاوە.

**الرَّهَبُ والرُّهب**: قۆڵی کراسو پۆشاك.

**الرُّهبانِيَّةُ**: وازهێنان لەکاروباری دونیاو دابڕان لەهەموو خۆشیو لەزەتێکو گۆشەگیر بوون بۆ خودا پەرستی.

**الرُّهبة**: (رهبة الماء): لەزاراوەی پزیشکی هەناوی دا بریتییە لە نەخۆشییەکی گوازراوەو بڵاوەبوو بەهۆی لیکەوە ڤایرۆسەکەی دەگوێزرێتەوە لەو دڕندانەوە کەلەپێڕی سەگن بۆناو جەستەی ئادەمیزادو گیانلەبەری تر، دیاردەی ئەم نەخۆشییە ئەوەیە توشبووەکە ماسولکەی هەناسەدانو قوتدانی گرژدەبنو وێك دێنەوە ٥ شێتیو تێکچونی ئەعصابو گەلێ پشێوی جەستەیی تری لێ دەکەوێتەوە.

**الرُّهبنة**: بەمانا (الرّهبانية)دێ.

**الرَّهَبُوت**: بەمانا (الرُّهبة)دێ، دەگوترێ: (رهبوت خير من رحموت): ئەگەر بترسیو تاوان نەکەی باشترە لەوەی تاوان ئەنجام بدەیو بەزەییان پێتا بێتەوە.

**رَهْبَلَ**: قسەی کردنو کەس لێی حاڵی نەبوو.

**تَرَهْبَلُ**: بەشێوەی گورگەلۆقە کردن ڕۆیی.

**الرَّهْبَلُ**: قسەیەك لێی حاڵی نەبی (قسەی بێ مانا).

